- نـــاوی کتێب: دوو مـاچ و یەک زلـــلە

- نـــووســـــین: رزگار محـمود فـــەرەج

- بـــــابـــەت: کۆمــەڵــە چـــــیــرۆک

- نەخشەسازی ناوەوە: زەردەشـت کاوانـی

- نەخشەسازی بەرگ؛ محمد سیامەند

-وێـنـــــەکان: مـــامۆســتا هـــیـمـداد

- تـــیـــــراژ: ٢٠٠٠ دانـــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٤٤٦ )ی ساڵی ٢٠١٥ی دراوەتێ

# نـــاوەڕۆك



سێ بنەمای سەرەکی هەیە

بۆ ئەوەی بتوانیت چیرۆکێکی باش بنوسیت...

بەداخەوە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە



# ئەشکەوتی
# بوکی چـــل شەوە

گەورەترین دیاری خودا بۆ
مرۆڤ چێژە، چێژ میوەی ژیانە

بەقەد پاڵی یەکێک لە چیا باڵا بەرزەکانی کوردستانەوە گوندێکی فرە ماڵ وەک بەروانکە خۆی لە سنگی ئەو چیایە گیرکردبوو . کەمێک بەفری زستان تارایەکی جوانی بە لوتکەکەی پۆشی بوو، دەمەو ئێواران کاتێک سێبەری چیاکە تەواوی گوندەکەی دادەپۆشی. ئەگەر سەیرێکت بکردایە، چەندین پیاو و ژنت دەبینی کە چۆن بەهێسترو ماین و گوێدرێژەکانییانەوە، تەلاشە بەفریان لەو لوتکە سەختەوە دەهێنایە خوارەوە .

سەرەڕای هێنانی بەفر کاتێکی خۆشیان بە گۆرانی و یاری و قسەی خۆش بەسەردەبرد. دەنگی گۆرانی و قاقای پێکەنینیان تا نزیک ڕووبارەکە دەنگی ئەدایەوە.

هەر کە دەگەشتنەوە ماڵ، چەند پارچە بەفرێکیان دەکردە ناو تەپەتۆرێکی گەورە، کە نان و خواردەمەنییان تێدا هەڵدەگرت تاکو خراپ نەبێت .

چەند پارچەیەکی تریان ئاو و دۆ و ماستاویان پێ سارد دەکرد. دوای دۆشینی مەڕ و بزنەکان و ڕایی کردنیان، لەسەر سەربانی ماڵەکانیان سفرەیان دادەخست و نانی ئێوارەیان دەخوارد.

دانیشتوانی ئەم گوندە زۆربەیان ژن و ژنخواز و خزم و کەس و کاری یەکتربوون، دابو نەریتی تایبەت بەخۆیان هەبوو.

پیاوێکی عاقڵ و بەئەزموون ڕیش سپی ئاواییەکە بوو، پێیان دەگوت ( سلێمان ئاغا ) خاوەنی مەڕو ماڵات و زەوی و

زارێکی زۆر بوو، گەلێک یارمەتی خەڵکی گوندەکەی دەدا و ئەوانیش ( سلێمان ئاغا ) یان، زۆر خۆش ئەویست.
سلێمان ئاغا تەنها خۆی و ژنێک بوون، منداڵیان نەبوو. دڵسافی و دەروون پاکی ئەم ژن و پیاوە وای کردبوو هەموو خەڵکی گوندەکەیان بە کوڕ و کچی خۆیانیان ئەزانی، خەڵکی گوندەکەش هیچ کارێکیان نەدەکرد بێ پرسی ( سلێمان ئاغا).
ئەگەر کچێک شوی بکردایە یان کوڕێک بی ویستایە ژن بهێنێ، سەرەتا پرسیان بەو دەکرد .
لە کەوانۆی چیاکەوە لە نێوان دوو لەتە شاخ دا، ئەشکەوتێک دەمی بۆ ئاسمان کردبویەوە، پێیان دەگوت : ( ئەشکەوتی بوکی چل شەوە )
دەرگای ئەشکەوتەکە زۆر گەورە نەبوو، تا نەچویتایەتە پاڵی نەت دەزانی ئەشکەوتە، لە ڕووی ناوەوە قادرمەیەکی دەستکرد دروستکرابوو بۆ ئاسانی چونە ژوورەوە . ئەشکەوتێکی زۆر خۆش بوو، دەتگوت جێی میر و پاشاکانی کۆنە . نەریتی خەڵکی ئەم گوندە وابوو، ئەگەر کوڕ و کچێک ژیانی هاوسەرییان پێکەوە بنایە، دەبوایە یەکەم شەو لەم ئەشکەوتە ڕۆژیان بکردایەتەوە. لە کاتێکی وادا خەڵکی گوندەکەش دەیان حەیوانیان سەردەبڕی و گۆشت و پڵاوێکی زۆریان لێ دەنا و چاوەڕێیان دەکردن . لەو شەوەدا سلێمان ئاغا لەگەڵ باوکی زاوا لە نزیک ئەشکەوتەکە ئەمانەوە و چاو

دێرییان دەكردن . كاتێك پیاوەكە بەزاوا بوایە، چرایەكی لە دەرگای ئەشكەوتەكە بەرز ئەكردەوە. بەم شێوەیە سلێمان ئاغا و باوكی زاوا تێدەگەشتن و بەو چەكانەی پێیان بوو چەند جارێك تەقەیان دەكرد بە ئاسماندا. خەڵكی گوندەكە دەیانزانی پیاوەكە بە زاوا بووە، بە جارێك دەنگیان بەرزدەكردەوە و هەتاكو بەیانی لە دامێنی ئەو چیایەدا تەپڵ و گۆرانیان ئەووت و هەڵدەپەڕین.

بەیانی كاتێك خۆر هەڵدەهات، خەڵكی ئاوای لە بەردەم ئەشكەوتەكەدا كۆدەبوونەوە.

سلێمان ئاغا بانگی لە بوك و زاوا دەكرد بێنە دەرەوە، ئەوانیش دەهاتنە دەرەوە و خەڵكەكەش پیرۆزباییان لێدەكردن.

پاشان بەخۆشییەوە دەچونە سەر مەزاری (زمڕووت) و (كاروانی گوڵ و دڕك) كە لە نێوان دوو دار سنەوبەری گەورەدا لە نزیك ئەشكەوتەكەوە نێژرابوون .

هەموو جارێك لەم جۆرە بۆنانەدا، سلێمان ئاغا لەسەر گۆڕەكان ڕادەوەستا و چیرۆكی زمڕووت و كاروانی گوڵ و دڕكی بۆ خەڵكەكە دەگێڕایەوە و دەی فەرموو ((ئەم ژن و پیاوە كۆچكردووە لە دێر زەمانەوە لێرە نێژراوون، ئێمە زۆربەمان نەوەی ئەمانیین و ئەوانیش داپیرە و باپیرە گەورەی ئێمەن . دەگێڕنەوە كاتی خۆی باوكی ئەم كاروانە پێنج ژنی هەبووە . لەم پێنج ژنە تەنها یەك كوڕی هەبووە

ئەویش ئەم كاروانەیە كە لە خۆشەویستی دا پێیان ووتوە (كاروانی گوڵ). دەڵێن: كاتێک ئەم كاروانە لە دایک ئەبێت، لە خۆشیا سێ ڕۆژ و سێ شەو شایی و هەڵپەڕكێ دەكرێت و لە گوندەكانی دەوروبەریشەوە خەڵكێكی زۆر هاتووە.
لەبەر ئەوەی كوڕی تاقانەی باوكی بووە لەبەری پێنج ژن، خۆشەویستی ونازێكی زۆری پێدراوە، باوكی دەوڵەمەند و ئاغایەكی گەورەی ناوچەكە دەبێت . پێشتر ئێرە گوند نەبووە، ئەمان لە گوندەكانی ئەوبەر ڕووبارەكە ژیاون.
ئەم كوڕە ووردە وردە گەورە دەبێت . كوڕێكی جوانخاس و باڵابەرزی لێ دەردەچێت:
ڕۆژێک كاروان و باوكی بەسەر ئەسپەوە لە ڕاو دەگەڕانەوە، لە نزیک تاڤگەكە ( زمڕووت ) و یەک دوو ئافرەت دەبینن خەریكن پێستە خۆش دەكەن . هەر كە كاروان چاوی بە زمڕووت دەكەوێت، ئاگرێک بەردەبێتە دڵی بە ئاوی ڕووبارەكەش نەدەكوژایەوە.
زمڕووت كچێكی تا بڵێی جوان و شەرمن بوو، كچی میرزا بارامی ڕیش سپی ئاواییەكە دەبێت . پاش هەفتەیەک دەچن بۆ خوازبێنی.ماڵی كچەكە زۆریان پێخۆش دەبێت بۆ ئەم خزمایەتییە. ئەوەی جێگەی نیگەرانی دەبێت. برازایەكی میرزا بارام حەزی لە زمڕووت دەبێت و بەم خوازبێنییە ڕازی نابێت. بۆیە دەست دەكات بە بوختانی خراپ بۆ كاروان و بە كابرایەكی پیس و زاڵم ناوی دەبات،

نازناوی (کاروانی دڕک) بە ناو ئاواییەکەدا بڵاو دەکاتەوە، وەک ئاماژەیەک بە مرۆڤێکی چاوچنۆک و فێڵ باز . بەم جۆرە ماڵی میرزا دەکەونە گومانەوە، بە دوای ڕێگە چارەیەک دا ئەگەڕێن.

زمڕووت کاتێک بەمە ئەزانێت زۆر دەگری، چونکە کاروانی زۆر خۆش ئەویست، سور بوو لەسەر ئەوەی شوی پێبکات. ئەو قسەو باسانەی بەدرۆ دەزانی کە ئامۆزاکەی دەی کردن. هەر کە کاروان ئەم دەنگۆ و قسە و قسەڵۆکانە دەبیستێت، دەکەوێتە سۆراغی ئەو کەسەی ئەم بوختانانەی بڵاو کردۆتەوە.

ڕۆژێک زمڕووت هەموو شتێکی لە بارەی ئامۆزاکەیەوە بۆ کاروان باس دەکات . کاروان زۆر توڕە دەبێت: بڕیاری کوشتنی دەدات و کون بەکون بە شوێنی دا دەگەڕا. بەڵام ئەو خۆی شاردبویەوە و کەس نەی ئەزانی لە کوێ یە و چوە بۆ کوێ . دوای چەند ڕۆژێک زمڕووت مارە دەبڕن و پلان دادەنێن کە شاییەکی گەورەی بۆ بکەن لە ئاواییەکەدا. شەوێک لە نزیک ماڵی خۆیان چەند کەسێک کاروان دەگرن و برێکی باشی لێ دەدەن،

باوکی کاروان پیاوێکی زۆر عاقڵ و ژیر بوو، ئەم ڕووداوە زۆر کاری تێکرد، هەموو لایەک دڵگران بوون بەم ڕووداوە .

دوای ئەم ڕووداوە، باوکی کاروان بڕیاری دا ماڵەکەی باربکات بۆ ئەوبەری ڕووبارەکەو گوندەکە جێبهێڵێت. تاکو فیتنە لە

گوندەکەدا دروست نەبێت، هەر چەندە ڕیش سپی و پیاو ماقوڵانی گوندەکە زۆریان پێ ناخۆش دەبێت و دەڵێن: ئێمە کێشەکە چارەسەر دەکەین. باوکی کاروان نەی دەویست ئەو کوڕە تاقانە خۆشەویستەی لە دەست بدات. هەر بۆیە بەیانییەکی زوو زۆربەی شتەکانیان گواستەوە ئەوبەر ڕوبارەکەو لەبن درەختێکی گەورەدا لە دامێنی ئەم چیایەدا، باروبنەیان دانابوو .

ئەوەی دڵخۆشی دەکردن (زمڕووت)یشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو . ئەم کوڕ و کچە هەژار و عاشقە سەرەڕای ئەوەی مارەبڕی یەکترن، دەستیان بەردەستی یەکتر نەکەوتبوو، ئێستاش ئەوەتان لەم شاخ و داخە چۆڵان .

باوکی کاروان. کاروان و زمڕووتی هێنا بۆ ئەم ئەشکەوتە، یەکەم شەویی ژن و مێردایەتییان لەم ئەشکەوتە بەسەربرد. بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆردا هەتا نیوەڕۆ ئەم پێنج دایکە بەستەزمانە و ئەو پیاوە پیرە داماوە، چاوەڕێی ئەم تازە بوک و زاوا عاشقەیان دەکرد، کە لەو ئەشکەوتە بێنەدەرەوە و پیرۆزباییان لێبکەن.

بەڵام هیچ دەنگ و هەواڵێکیان نەبوو . دایکی کاروان خۆی ڕانەگرت و چو بۆ لای ئەشکەوتەکە تا هەواڵێکیان بزانێت، هەر کە نزیکی ئەشکەوتەکە دەبێتەوە . دوو سێ جار بانگیان دەکات . زمڕووت گیان ..کاروان گیان. کەس جواب ناداتەوە. ماوەیەک لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا چاوەڕێ دەکات، پاشان

چەند جارێكی تر بانگیان دەكات، بەڵام بێ ئەنجام دەبێت، بەسام و ترسێكەوە دەچێتە ناو ئەشكەوتەكە، سەیر دەكات: هەر دووكیان باوەشیان كردووە بەیەكتردا بێ بەرگ و پۆشاك دەگەڕێتەوە و یەك دوو جاری تر بانگیان دەكات.
بەڵام نوزە و دەنگیان لێوە نایەت . مۆتەكەیەك سەراپای جەستەی دادەگرێت و بەپەلە دەچێتە سەر سەریان، بانگیان دەكاو دەستیان ڕادەوەشێنێت، كەسیان ناجوڵێنەوە.
هەر لە ناو ئەشكەوتەكەوە قیژە و هاوارێك دەكات، بە جۆرێك لە گوندەكانی ئەوبەرەوە هاوارەكە دەبیسترێت.
باوكی كاروان لەگەڵ ژنەكانی تری و شوانەكەیان بەدەم هاوار و قیژەكەوە دەچن. بەپەلە دەچنە ناو ئەشكەوتەكە: دەڵێن چی بووە؟ چییان بەسەرهاتووە؟ دایكی كاروان بەدەم گرییانەوە، دەڵێت مردوون..!!؟ لەوە دەچێت شتێك پێوەی دابن.كاتێك سەرچەفەكەی سەریان لادەبەن و ئەوانیش سەیریان دەكەن و دڵنیادەبن لەوەی كە مردوون.
بۆیە هەموویان دەست دەكەن بەگریان بە جۆرێك دار و درەخت و شاخ وكێوی ئەوناوەش بۆیان دەگرییان .
هەر لە ئەشكەوتەكەدا بەیەك دوو بەتانی دایان ئەپۆشن دەستیان لێنادەن، دەرگای ئەشكەوتەكەش بەچەند لقە دارێك ئەگرن، تاكو دوربن لە گیانداری دڕندە و هیچ زیانیان پێنەگات.



دوای چل ڕۆژ لەم ڕووداوە، ئێوارەیەکی درەنگ بە ڕاکردن و هەناسکە برکێ شوانێک خۆی گەیاندە لای باوکی کاروان و ووتی: مامە گیان کاروان و زمڕووتم بینی نزیک ئەشکەوتەکە بۆ ئێرە دەهاتن، بە خوا بەو چاوانەی خۆم بینیمن باوەڕم پێبکە. باوکی کاروان ووتی کوڕم تێک چووی ئەوان مانگێک زیاترە مردوون.

بڕۆ بۆ ئاژەڵەکانت جێهێڵاوە، ئەم قسانە چییە دەی کەیت..!! پاش کەمێک لە بەرزاییەکەوە ( کاروان و زمڕوت) دەرکەوتن.!! شوانەکە هاواری کرد ئەوە ئەوانن، ئێستا باوەڕم پێدەکەن . سەیر کەن : کاتێک دایکی کاروان سەیری کردن یەکسەر لە هۆش خۆی چوو . بەیانی ڕوداوەکە بە هەموو گوند و شارو شارۆچکەکاندا بڵاو بویەوە. خەڵکی بەم ڕووداوە زۆر سەر سام و سەرنج ڕاکێش بوون. زمڕووت و

كاروان بێ ئاگا بوون نەیان دەزانی چی ڕووی داوە .!!
دواجار تێگەشتن (( كە بۆ ماوەی چل شەوە لە ئامێزی یەكتردا لە ناو ئەو ئەشكەوتەدا مەست بوون و ڕۆحیان تێكەڵ بەیەک بووە و بە هەوای چێژ تا ئێستا ژیاوون ))
بۆیە لەو ڕۆژەوە ئەم ئەشكەوتە بە (( ئەشكەوتی بوكی چل شەوە )) ناو دەبرێت . هەر كەسێ ژن بێنێ وەک هێمایەک یەكەم شەوی زاوایەتی لەو ئەشكەوتە بەسەر دەبەن ..

بەدەنگی قوقەقوقی کەڵەشێری ماڵی دراوسێکەمان خەبەرم بویەوە، ئەو بەیانییە سپێدەیەکی گەلێ خۆش بوو، وام هەست ئەکرد ئەم شەو چێژ و لەزەت بارییوە بەسەر ئەم شارەدا، بۆنی نێرگز و ڕێحانە و وەنەوشە و گوڵەباخ سەراپای شاری تەنی بوو . هەر کۆڵانێک بچویتایە جۆرێک بۆن مەستی دەکردیت.

پەرجوی ئەم دیمەنە لەوەدابوو، هەرکەسە و حەزی لەچ بۆنێک بوایە بۆی دەچوە ژووری نوستنەکەی و بە لوتی دا ئەچرپاند . هەستە کاتی خەونییە، کاتی ژییان و عیشق و خۆشییە.

لەسەر جێگاکەم هەستام و پەردەکەم لاداو پەنجەرەی ژوورەکەم بەسەر باڵەکۆنەکەدا کردەوە، تاکو زیاتر بۆنی خۆشی ئەو نێرگزە تازە خونچە تەقیوانە بێتە ژوورەوە.

سەیرێکی دەرەوەم کرد بینیم:

نمە نمەی باران لەگەڵ شنەبادا گەمە و یاری دەکەن. وای چ دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش بوو . ویستم سەرم بەرمە ژوورەوە تاکو یارییەکەیان لێ تێک نەدەم، بەڵام نەم توانی . هەر لە باڵەکۆنەکەوە سەیرێکی باخچەی حەوشەکەمانم کرد. ووتم بزانم ئەم بۆنە لە کوێوە دێت.

خۆزگە هەر سەیرم نەکردایە، هەر گەڵاو گوڵ و تەیرو باڵندەبوو هێرشیان بۆ هێنام و دەستەکانیان گرتم و بەرەو خۆیانیان ئەبردم. ویستم هاوار بکەم دەنگم دەرنەدەهات.



نەشم توانی بەرگرییان لێ بکەم، لە پڕ لەناو حەشاماتی تیسکی چیمەنی حەوشەکەماندا خۆم بینییەوە، بە جۆرێک ئەو تیسکە جوان و ناسکانە باوەشیان کردبوو بە بەیەکدا، وەک ئەو بەندکراوانە ئەهاتنە پێش چاووم کە تازە لە

بەندیخانە بەردەبن و بە تامەزرۆییەوە بە خۆشەویستانیان شاد ئەبن. من جگە لە خۆشی هەستم بە هیچی تر نەدەکرد، قاقایی پێکەنینی گەڵا و گوڵەکان و تەیر و تویری ناو باخچەکە نەغمەیەکی وای دروست کردبوو، غەمبارترین ڕۆحی دەهێنایە سەما و پێکەنیین. من وام ئەزانی هەموو شار و دەر و دراوسێکانمان و خوشکە بچووکەکەم گوێیان لەم پێکەنیین و شادییەیە.

بە دەنگی زۆر بەرز پێدەکەنیم و لە ناو چیمەنەکەدا تەپاو تلم دەکرد. گڤە گڤ و دەنگی ڕۆشتنی سەیارەی ناو شەقامەکە، وەک دەنگی هاژەی ڕوبارێک دەهاتە گوێم.

خوشکە بچوکەکەم بەدەنگی پێکەنینەکەم هاتە دەرەوە بۆ ناو چیمەنەکە، دووجار بانگی کردم، شادڵ!! شادڵ!! ئەوە چیتە بۆ وا پێدەکەنیت؟!.

منیش هەستامە سەرپێو گوتم: چی یە بۆ پێنەکەنم، مەگەر تۆ ئەمڕۆ دڵخۆش نییت؟

- بۆچی دەبێت دڵخۆش بم، مەگەر چی بووە.
- ئەی تۆ بۆنی ئەو هەموو گوڵ و ڕێحانەیە ناکەیت؟
- نا: بۆنی چی. تۆ تێک چوی لە بەر ئەو بارانەدا پێ دەکەنییت؟

چووم بەرەو ڕووی خوشکەکەم: نا. من تێک نەچووم من شێت نییم. ئەوانە شێتن چاوییان بەسەوزایی هەڵنایە و بەگەڵا و گوڵ و درەخت نامۆن . ئەوانەی حەوشەکانییان

کۆنکرێت و کاشی ڕێژ دەکەن، شوێنێک ناهێڵنەوە کە خاک لێوەی هەناسەیەک بدات.باران بۆیە دەبارێت تاکو ئێمەی مرۆڤ پاک بکاتەوە، کە چی ئێمە لە باران هەڵدێین و دەمانەوێت تەڕنەبین.

ئێمەی مرۆڤ زۆر شت تەڕمان ئەکات کەچی بەتەڕبوونی نازانیین، مرۆڤە نەخۆشەکان بینینیان جیاوازە بۆ جوانییەکان و لەزمانی سروشت ناگەن.

بەڵام ئەوانەی دەروونیان پاکە لە زمانی باران و هەورەکان تێ دەگەن کە چۆن بە گرمە گرمەکەیان بانگمان دەکەن، کە لە ژوورە تاریکەکانی غەم و ڕق و قین بێینەدەرەوەو لە بەر بارانی موحیبەت دا خۆمان بشۆین ...

# ئەو کەڵەشێرەی
# منی خوارد

مرۆڤ هەر ئەوەندەی لە
شوێنی خۆی هەڵکەنرا، لە
هیچ شوێنێکی تر ناحەوێتەوە

بەناو قەڕەم و گژوگیاکاندا، لە تولە ڕێیەکی باریکی پێچاوپێچەوە، خۆم گەیاندە کانییەکە، کە پێیان دەگوت: کانی دوو قرژاڵ.

لە تینویەتی دا لێوم وشک و چاووم دەرپەڕی بوو، بە سکا بۆی کەوتم و دەمم نا بەئاوەکەوە.، هەستم کرد وردە وردە هێز بۆ جەستەم دەگەڕایەوە، دەمم لە ئاوەکە دەرهێنا و سەرێکم بەرزکردەوە سەیردەکەم مارێک لەوبەری کانییەکە زمانی دەرهێناوە و سەیرم دەکات، یەکەم جارم بوو مار بەچاو ببینم، منێک لەم تەمەنە بچوکەدا ئەگەر ڕۆژگار وای لێ نەکردمایە لە باتی لە دەشت و دەر ئەبو ئێستا لەقوتابخانە بوبام.

وەک چۆن یەکەمجار خواخوام بوو بەس بگەمە کانییەکە، ئێستا خواخوامە زوو لە کانییەکە دوور بکەومەوە، بەهێواشی خۆم کشاندە دواوە و کەمێک بەرز بومەوە مارەکە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەو بەرەو ڕووم هات، لە ترساندا قیژاندم و هەتا هێزم تییایە ڕام کرد و چوومە ناو جاڕە گەنمەکە، کاک ئەحمەدی دراوسێ مان لەگەڵ یەک دوو کەسی تر بەدەم هاوارەکەمەوە هاتن وتیان چی بووە چیتە بۆ واڕا دەکەی، بەدەم و چاوێکی زەرد هەڵگەڕاو و ترساوەوە، تفێکم قوت داو ووتم مار ! مارێک کەوتە شوێنم.

ڕاستییەکەی ئەوانیش نەیان وێرا بچن بۆ کانییەکە، کاک ئەحمەد وتی : کوڕم نەم وت بەتەنها دوورمەکەوەرەوە،

یەکەم جارم بوو بێم بۆ ئەم شوێنانە، دیمەنێکی سەیر و سەرنج ڕاکێش بوو، دەڕاسەیەکی سوری دەنگ زل کە شێوەی لە دێو و درنج ئەچوو، کۆمەڵێکی زۆر ژن و پیاو و کوڕ و کچ بە شەرواڵی پینەکراو، یەکی سەرپۆشێکی چڵکن بەسترابوو بەسەر و ملیانەوە و بەرچاکێک کە لە گونیە درووست کرا بوو بە شان وملیانەوە شۆڕ بو بوویەوە، یەکێک ڕائەوەستا و یەکێک دائەنەویی یەوە بۆ گوڵە گەنمێکی جێماوی دەم دەڕاسەکە.

تینی گەرمای ئەم وەرزە لەناو ئەم جاڕە سروتەدا، پێستی دەم و چاویانی سوتاندبوو، ئەگەر سەیری هەر یەکەیانت بکردایە خەم و پەژارەیەکی قوڵ لە ڕوخساریان ئەبینرا، زۆر جار هێندە لە دەمی دەڕاسەکە نزیک ئەبوینەوە، شۆفێری دەڕاسەکە بە جوێن و قسەی ناشیرین لە دەڕاسەکەی دووری ئەخستی نەوە.

( هەمیشە دەڵێم خوایە کەس توشی برسییەتی و هەژاری نەکەیت، بەڕاستی هەژاری مرۆڤ توشی شەرمەزاری ئەکات ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبێت )

دەمەو ئێواران خەڵکەکە لە شوێنێکی تەختدا کۆ ئەبونەوە گوڵە گەنمەکانیان ئەخستە ناو فەردەیەکەوە و دەمی فەردەکەیان ئەبەست، پاشان بە پێ ئەچونە سەری و بەدار لێیان ئەدا تا گوڵە گەنمەکان بە تەواو وورد ئەبوو، دواتر هەڵیان ئەڕشتە سەر چەند گونییەک و شەنیان ئەکرد

بەهەوای دەمەو ئێواران گەنمەکەیان پاک ئەکردەوە لەکاو کۆت و قەلاس و پوش و پەڵاش، گەنمەکەیان ئەخستە ناو بنە گونییەک، زۆر بەدڵخۆشی ئەیان بردەوە بۆ ماڵەوە . ئەو ڕۆژە بە برسی و جەستەی ماندووە وە بە جادە خۆڵەکەدا کەوتینەڕێ بۆ ناو ئۆردوگا، ( مرۆڤ هەر ئەوەندە لە جێ ی خۆی هەڵکەنرا ئیتر لە هیچ شوێنێکی کە ناحەوێتەوە ) ئەو خەڵکەی تۆ دەی بینیت ڕۆژانێک لە ناو شاری باو باپیریاندا خاوەنی سەروەت و ماڵ و ژیانی خۆیان بوون، بەڵام ئێستا هەریەکەمان دەربەدەر و لە ناو ئەم ئۆردووگا زۆرە ملێیانەدا بەژیانێکی کوللە مەرگی ئەژین، ماڵ نەبێ لەم ئۆردووگایەدا کەسێکیان نەکوژرابێت بەدەستی ڕژێمی ستەمکاری بەعس، تاکە تاوانی ئێمە ئەوە بوو کە کوردین و بە کوردی قسەدەکەین.



من منداڵ بووم تەمەنم زۆر نەبوو، لەگەڵ منداڵەکانی کاک ئەحمەدی دراوسێماندا هاتبووم بۆ گوڵە چنیین بۆ ئەم دەشتە، کاک ئەحمەد یەکەمجار نەی ئەهێڵا بچم لە گەڵیان ووتی کورِم تۆ منداڵی شتێکت لێ دێت برِۆ بڵێ بە باوکت ئینجا دەت بەین، ووتم:

پێم ووتووە پاشان رِازی بوو چوم لەگەڵیان، ئێوارە هاتینەوە، دایکم دەرگاکەی لێکردمەوە سەیردەکەم ئەگری و چاوی فرمێسکی پێوەیە کەمێک وەستاو بە تورِەییەوە ووتی:

ئەوە لە کوێ بووی ئەزانی شوێن نەما نەگەرِێین بە دواتا، ووتمان دەبێ چی بەسەر هاتبێت، چۆن بێ پرس دەرِۆی.

کە هاتمە ژوورەوە باوکم یەک زللەی لێدام و کەوتم.

ماڵی ئێمە هەژار بووین، باوکم کرێکاری دەکرد بەیانی دەرِۆی شێو دەهاتەوە، من دوو خوشکم هەبو لە خۆم بچوکتر، پێشتر من و خوشکەکەم لە قوتابخانە بووین بەڵام لەبەر هەژاری وازمان هێنا، تا ئێستاش حەز لە خوێندن ئەکەم.

لە ماڵەوە کەڵەشێرو مریشکێک و یەک دوو جوجکەمان هەبوو، باوکم زۆریانی خۆش ئەویست، سێ مانگ زیاترە گۆشتمان نەخواردووە.

من و خوشکەکانم زۆر حەزمان لەگۆشت بوو داوامان لە باوکم کرد کە ئەو کەڵەشێرەمان بۆ سەر ببرِێت، باوکم هەر رِازی نە ئەبوو، دوای یەک دوو رِۆژێک دایکم باوکمی رِازی کرد بەوەی ووتبوی ئەو منداڵانە گوناهن دەمێکە گۆشتیان نەخواردووە

با ئەو کەڵەشێرەیان بۆ سەر ببڕین .شەوێکیان دایکم ووتی: سبەی ئێوارە کەڵەشێرەکە سەرئەبڕین
باوکتان ڕازی بووە لە خۆشییا تا بەیانی خەومان لێ نە دەکەووت ئەو شەوەمان بە هەزار ساڵ لێ ڕۆشت، نزیکی نیوەڕۆ دایکم ووتی پێمان بڕۆن کەڵەشێرەکە بگرن، کەڵەشێرەکە لە دەرەوە بوو دیتمانەوە و بە کشەکش هێنامانەوە حەوشەکە، ویستمان بیکەینە کولانەکەو بیگرین، بەڵام لەترسی ئێمە نە چووە ناوی و بە قوقەقوق هەڵفڕییە سەر دیواری حەوشەکەو خۆی هەڵایە دەرەوە، ئێمەش شوێنی کوتیین کونبەکون و کۆڵان بە کۆڵان بەڵام بۆمان نە ئەگیرا، منداڵانی گەڕەک زانییان ئێمە دەمانەوێت ئەو کەڵەشێرە بگرین ئەوانیش یارمەتییان داین و کەوتینە شوێنی.
کەڵەشێری بەستەزمان نەی ئەزانی خۆی بکات بە چ کون و کەلەبەرێکدا بەسەر بەرد و دار و دیواردا دەی قوقان و ڕای ئەکرد ئێمەش نزیکەی سی منداڵ ئەبویین بە قیژە و هاوارکردنەوە کەوتبوینە شوێنی نیوەی ئۆردوگا زانی کە ئێمە ئەم شەو گۆشتمان هەیە و کەڵەشێر سەر ئەبڕین.
هەرچەند زۆر ڕامانکرد بە دوای دا بەڵام بۆمان نەگیرا، یەکێک لەمنداڵکان دارلاسیکێکی بەدەستەوە بوو ووتی بەمن ئەتوانم بەم دارلاسیکە قاچی بشکێنم و بیگرین، ئەوەی گرنگ بوو لام ئەوە بوو کە ئەم شەو بە هەر شێوەیەک بێت گۆشت بخۆیین، ووتم باشە بەس بیگرن چی لێئەکەن لێی بکەن.

پاش کەمێک بەو دارلاسیکە بەردێکیان دا لە قاچی و شەلیانکرد و منداڵکان بەقیژە وە بەرەو ڕووی ڕۆشتن و گرتیان خوێن لەقاچی ئەهاتە خوارەوە،

هێنایان و دایان بەدەست منەوە، بە دڵخۆشییەوە هێنامەوە بۆماڵەوە . دایکم دەستی کرد بە پاکردنی منیش هاتمە دەرەوە بۆ ناو منداڵەکان باس باسی گرتنی کەڵەشێر و ئازایەتی هێمن ئەکرا کە بە دارلاسیک بەردی داوە لە کەڵەشێرەکە .
نزیکەی بانگی شێو ڕۆشتمەوە بۆماڵەوە بۆنی گۆشتی سورۆکراو و فرۆجاوی کەڵەشێر یەک دوو کۆڵان دەڕۆیی، لەگەڵ دوو خوشکەکەم و دایکم لەسەر سفرە دانیشت بوین گۆشتی کەلەشێرەکە لەسەر بەلەمێ برنج ڕازابویەوە لە بەردەمماندا،

چاوەڕێی باوکممان ئەکرد بێتەوە و دەست پێ بکەین.
کاتێک باوکم لە کرێکاری ئەگەڕێتەوە دەبینێت بەردەم ماڵمان پڕە لە منداڵ زۆر دەترسێ دەڵێت: شتێکمان لێ نەقەومابێ!! پرسیار لەمنداڵەکان ئەکات ئەوچی یە بۆ دوور ناکەونەوە، منداڵەکان ڕووداوی گرتنی کەڵەشێرەکە دەگێڕنەوە بۆ باوکم و باسی دارلاسیکەکەی هێمنیش ئەکەن کە داوییەتی لە کەڵەشێرەکە .
باوکم سەرەڕای ماندوی کرێکاری زۆر تورە ئەبێت و بە چڵە دارێکەوە خۆی ئەکات بەژووردا، خۆشی خۆشی باوکم هاتۆتەوەو دەست بەخواردن ئەکەین، سەیر ئەکەم باوکم

بەدار و زللە و قسەی ناشیرین تێمان بەربوو من و هەردوو خوشکەکەمی خستە ژوورێک و دەرگای لێ داخستین، ئێمەش جگە لە گریان بۆ بەختی خۆمان هیچ مان پێنەکرا، دایک و باوکم کردیان بەشەڕ لەسەر ئەو ڕووداوە و دایکم دەی ووت : بۆ واز لە ومنداڵانە نایەنیت چییان کردووە، بەم ئێوار بۆ لێیان ئەدەیت، ڕاستییەکەی دایکیشم زۆر گریا، باوکم دەی ووت ئێوە حەیایی منتان بردووە لەم ئۆردووگا، بۆ پاروە گۆشتێک دنیاتان تێگەیاندووە، کێ دیویەتی بەبەرد کەڵەشێر بگیرێت . ناخۆشترین ئێوارەبوو بۆمان هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە...

# ئەو مێرولەی بوو بە فەیلەسوف

دەست ڕەنگینی مرۆڤ بە هەموو
شتێکەوە دیارە، بێجگە
لە خۆی .. کە چییەتیەکەیەتی

نزیکەی هەفتەیەکە ئێمەی مێرولەی نەوسن لە ژێر کەپری ئەم چایخانەدا، باروبنەمان گرتووە .بەدەوری کەوچک و پیاڵەو ژێرپیاڵە و ووردە شەکری سەر مێز و بن مێزی ناو چایخانەکەدا هەر دەهات و دەچووین .هەر ڕۆژە و دە پانزەیەکمان دەبوینە قوربانی.

( هیچ گیاندارێک هێندەی ئێمەی بەستەزمان و بێ دەسەڵات کۆمەڵکوژو ئازار نەدراوە لە لایەن ئەم مرۆڤە پێ زلانەوە ) دەمێکی زۆرە لە هەرێمی ئەم گیاندارە دوو لنگ درێژەدا، لە نزیک یەکەوە دەژین، ئێمە لە میهرەبانی خۆمان بەردەوامین، بەڵام لە دوای پێغەمبەرانەوە، ڕۆژێک کەسێک نەبوو دڵی بۆمان بسوتێت و هاوار و گریانی خوێنیینی لە دەست چونی هەڤاڵەکانمان ببیستێت . ئەی دێوە نابوتەکە !.

ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تورەمان دەکەیت. گرنگ نییە ئایا تۆ بە ئاگاییەوە یان بێ ئاگایی ئەم کارەدەکەیت، گرنگ ئەوەیە تۆ ژیانمان تێک دەدەیت، تەمەنی کورتمان کورتتردەکەییت.)

لە ڕاستی دا سەرەڕای مردنی هاوڕێکانمان، ئەم هەواڵی مەرگە بۆ زۆربەی زۆرمان ببوو بە شتێکی ئاسایی بۆیە لەم چایخانەدا زیاد لە هەر شوێنێکی تر کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەردەبرد.

شوێنی چایخانەکە لە ناو مەرزێک بوو لە سەر سنور .لە پشتییەوە زنجیرە شاخێک و لە تەنیشتییەوە تاڤگەو ڕووبارێک، دیمەنێکی جوانی بەو ناوچەیە بەخشیبوو .

خاوەنی چایخانەکە پیاوێکی هەزەلی فشەبازبوو، زۆرجار کاتێک ئێمەی لەسەر شەکرە ووردە کەوتووەکان دەبینی، بە شۆخییەوە بە شاگردەکەی دەووت : کورە هەتیو خۆمن هەر تۆ بەخێو ناکەم، ئەم مێرولانەش بە خێودەکەم، ئەگەر من نەبم ئەم نەگبەتانەش لەبرسا دەمرن.

ئێمەی شارە مێرولە لە هەموو شارەکانی تر زیاتر کۆچ دەکەین، نەگبەتترین و بە هێزترین شارییین لە ناو جیهانی مێروولەدا. ئەگەر لە سەر ئاسن بێت یان لە ناو دەریا بێت، دەتوانیین شار دروست بکەین و شتێک بۆ خۆمان پەیدابکەیین.

ئێمە لەوە تێدەگەین شار دروست دەکەین و مرۆڤ دەی ڕوخێنێت، بەڵام لەوە تێناگەین، مرۆڤ خۆی شار دروست دەکات و هەر خۆشی دەی ڕوخێنێت.

یەکێک لە ئاریشەکانی مرۆڤ ئەوەیە هەر ڕۆژە و لە شکڵی مێرووپەک یان گیانداریێکدا خۆی دەنوێنێت، هەمیشە لەململانێدایە لەگەڵ دەرەوەی خۆی،

خۆی بە رابەری ئاوەدانکردنەوەی زەوی دادەنێت، ئایا ئاوەدانکردنەوە لە پێناو ژیان یاخود ژیان لە پێناو ئاوەدانی.

من جیاواز لە مێرولەکانی تر مێرولەیەکی نەگبەت و سەرەڕۆ بووم، لەوەتەی هاتوومەتە دوونیا بیر لە مرۆڤ و کارەکانی دەکەمەوە. هەر ئەمەش وایی کردووە، حەز بە مانەوە بکەم لەم چایخانەدا، دارمێویک ساباتی بۆ کەپری چایخانەکە

کردبوو، بۆڵە ترێیەکی زۆری پێوە بوو، زۆر جار هەڵ ئەزنایین بە دارەکەداو لە ناو گەڵاکانی دا خۆمان دەشاردەوە و یاری گەمەمان دەکرد، دەستمان دەکرد بە خواردنی ئەو ترێ تەقیوانەی سەر مێوەکە و تا دەمان توانی دەمان مژیی . ئێمەش وەک مرۆڤ هەندێک جار حەزمان لە شتی حەرامە، ئەو هەموو شیرینی و خواردەمەنییە زۆرە هەیە کەچی سەرمانکردۆتە ئەو چڵکاوەی ناو چایخانەکە.

جارێک لەسەر درەختەکەبووم، پیاوێکی کەتەی زل هات سێوێکی بە دەمەوە بوو، بە دەنگی خرمە خرمی ددانەکانی ووریابوومەوە، سەیرم کرد یەک دوو قەپی لە سێوەکە گرت و فرێدایە سەر زەوییەکە و لە ژێر کەپرەکەدا دانیشت، لەگەڵ چوار پێنج پیاوی تر کە لەوێبوون دەستی کرد بە قسەکردن، منیش وەک ئەوەی کێچ کەوتبێتە کەوڵم بەپەلە هاتمە خوارەوە و برادەرەکانیشم بە دوامدا هاتن و کەوتینە سەر سێوەکە، باوەڕپیبکەن بۆنی دەمی ئەو پیاوە هەفتەیەک لە جل و بەرگەکانمان نەدەبوویەوە.

ئێمە هەر خەریکی سێوەکەبوین و جارجارێک من گوێم لە قسەکانی ئەو پیاوانە دەگرت کە لە ژێر کەپرەکەدا بوون. باسی سیاسەت و هەڵبژاردن و خۆپیشاندانیان دەکرد. یەکێک لە پیاوەکان دەی گوت:

بەشەرەفم پیاوی ئاقڵمان ببوایە دەمێک بوو ببوین بە دەوڵەت، کاکە تۆ سەیری ئەمانەی لای خۆمان بکە ئەو هەموو

وولاتەی دونیا دەگەڕێن، ئەو هەموو پێش کەوتنە دەبینن، کەچی مێشێک میوانیان نییە و بیرێک لەم میللەتە قورِ بەسەرەی خۆمان ناکەنەوە. هەر جارە و توشی دەردێکمان دەکەن تا مێشکمان لە ناو دووکەڵی خەفەت دا بخنکێت.
بۆ یە بڕیارم داوە ئەم جارە دەنگ نەدەم، پیاوە جامانە بەسەرەکە دەنگی هەڵبڕی ووتی:
کاکە ئێمە لە سیاسەت نازانیین بۆیە ئەم قسانە دەکەیین:
برا کەس هەیە حەز نەکات گەلی خۆی سەربکەوێت و ببێت بە دەوڵەت، خۆ بوون بە دەوڵەتیش هێندە کارێکی ئاسان نییە، براکەم ئەم سەگ وگورگانەی دەور و بەرمان نایەڵن ئەگینا دەمێک بوو هەقی خۆمان وەرگرتبوو.
من دەڵێم بادەنگی خۆمان بدەیین بەشکم ئەمە خوایە ئەم بار و دۆخە بکەوێت بە بارێکدا. یەکێکی تر لە پیاوەکان قسەکەی پێ بڕی و گوتی: تازە چاک دەبێت !
ئێمە کات تێدەپەڕێنین بەم هەڵبژاردنانە، تۆ بڕۆ سەیری لایەنگرانی ئەم حیزبانە بکە بزانە چ بێ ڕێزیکردنێکە بەیەکتری، بڕۆ سەیری شەقامەکان بکە بزانە چ شەڕەپەڕۆ و یەکتر ناشیرین کردنێکە. هیچ مێشکی من ناتەقێنێت، هێندەی ئەم فەلسەفە لە کورد خستنە مشەخۆرە ی ناو ئەم حیزبە کلاوچییانە، یە کێک لە کێشە گەورەکانی ئێمە ئەوەیە لە زۆر کاتی مێژوویدا کورد بوون و کوردستانی بوونمان لە بیردەچێتەوە، بۆ دەبێت گروپێک وەک من بیرنەکاتەوە بە

خائینی دابنێین و زۆر بێ ئەدەبانە بیخەینە دەرەوەی بازنەی کوردایەتی ...

لەقسەی قۆڕ بەردەوام بوون، منیی بێ ئیشیش گوێم گرتبوو، پاش کەمێک کابرایەکی بە حساب ڕۆشنبیر سێوەکەی هەڵدایە ناو سەلەی زبڵەکەوە.

دوودانە ڕۆژی ڕێک لە ناو ئەو سەلەی خۆڵە دا ماینەوە .هەموومان توشی سکچوون بوین، کاتێک هاتینە دەرەوە، دەستمان گرتبوو بە سک مانەوە. خۆمان پێڕا نەدەگیرا، پێنجمان چوینە بن گەڵایەک ( قالۆنچە بەحالْمان نەبێت ) بۆن و فیقەو زیقەی قونمان ڕۆژە ڕێک دەڕۆیشت .

ناوەوەی چایخانەکە زۆر خۆش دیار بوو ئاواتم ئەوەبوو بچمە ناوی، ڕۆژێک هەر چۆنێک بێت خۆم گەیاندە ناوەوەی چایخانەکە، هەر خۆم بووم، سەیرم کرد زۆر خۆش و پاک و خاوێنە .چێشتخانەو شوێنی خوارنیشی لێیە. زۆر قەرەباڵغ بوو، هەر مێزەو یەک دووکەسێکی لەسەربوو نانیان دەخوارد. ژن و پیاوێک دەتگوت تازە لە مانگی هەنگوینی هاتونەتەوە، لەسەر مێزێک نانیان دەخوارد، جارجارێک قسەیەکیان دەکرد و پێ دەکەنیین.

بۆنی شتێکم کردبوو نەم دەزانی چییە. خۆم گەیاندە لایان و بەقۆنەرە پاژنە بەرزەکانی ژنەکەدا هەڵزنام .قول وقاچی ژنەکە ڕووت بوو، لە لێواری قۆنەرەکەوە ویستم بە بازۆڵەی قاچەکانیدا سەرکەوم . بەڵام پێستەکەی هێندە خز بوو، زۆر

قورس بوو سەرکەوتن پێیدا، دوو جار سەرکەوتم کەوتمە خوارەوە . ناچار لە قاچەکانی مێزەکەوە چومە سەرەوە و خۆم گەیاندە کەمەری ژنەکە، لە پشتەوە بەسەر جلەکانی دا بۆ سەرەوە سەرکەوتم.
پرچە خاوەکانی بە شان و ملی دا پژابوو، بۆنێکی خۆشی لێ دەهات، یەکەم جارم بوو بۆنی خۆش لە مرۆڤ بۆن بکەم.
پیسترین بۆن بۆنی مرۆڤە، چونکە بۆنی لەشی لە بۆنی دەروونی ناخۆشترە وە بۆنی دەروونی لە بۆنی لەشی ناخۆشترە. دەست ڕەنگینی مرۆڤ بە هەموو شتێکەوە دیارە جگە لە خۆی کە چییەتییەکەیەتی.
ئەوەندەی مرۆڤ لە مرۆڤ هەڵهاتوە هێندە لە هیچ گیانداریکی دڕندە هەڵنەهاتووە. چەند ناخۆشە بۆنێکی خۆش لە شتێکی ناشیرین بکەییت. بە بەینی تاڵەکانی زوڵفی دا بە ئەسپای دەڕۆشتم، لەسەر ملیوانی کراسەکەیەوە سەیرێکی خواردنەکەی بەردەم یانم کرد . زۆر سەرسام بووم منی ندی و بدی یەکەم جارم بوو شتی وا ببینم.
بەپەلە ویستم بچم بۆ لای خواردنەکە، لە پڕ نەم زانی چی ڕووی دا، مێردی ژنەکە نازانم لە کوێوە منی بینی دەستێکی لێدام بۆ ئەوەی لام بەرێت، خۆم پێڕانەگیراو کەوتمە ناو سنگی ژنەکەیەوە، بەڵام باش بوو هیچ ئازارم پێنەگەشت بە مەمک بەندەکەیەوە خۆم گرتەوە، وورتەم لە خۆم بڕی، بەڕاستی زۆر ترسام، ووتم خوایەگیان تووشی چی

بووم. دەنگە دەنگێک دروست بوو، ژنەکە ووتی: چی بوو؟ مێردەکەی ووتی: هیچ: مێرووڵەیەک بوو، نازانم چی لێ هات. پاش کەمێک ئاگام لێبوو هەڵسان و چونە ناو سەیارەکەیان و ڕۆشتن .منیی نەگبەتیش نەم دەزانی چی بکەم وەی لەوەی بجوڵێم وەی لەوەی لەم شوێنە تەنگەبەرەدا بمێنمەوە.
ناچار کەوتمە جوڵەو بە دوای دەروازەیەکدا دەگەڕام کە خۆمی لێوە ڕزگار بکەم.
لە پڕ وەک و ئەوەی بورکان و زەمین لەرزە ڕووی دابێت، ژنەکە وەک ئەوەی پەلاماری مار بدات، بە هەر دوو دەستەکانی هێرشی بۆ هێنام. بۆ بەرگریکردن لە خۆم منیش گازێکم لێگرت، پەنجەیەکی بەرم کەوت و دام بە چاڵای ناوکیدا و کەوتمە سەر پشتوێنی کەمەری.
ژنەکە ڕەنگی پەڕیی بوو، بەدەنگێکی نوساوەوە دووجار بە مێردەکەی ووت: سەیارەکە ڕاگرە! سەیارەکە ڕاگرە !با داببەزیین شتێک ئەوەتە لە لەشما . پیاوەکەی سەیارەکەی خاوکردەوە و لە لێواری جادەکە وەستا . دابەزین و لە جادەکە دوورکەوتنەوە. ئەم بەرو ئەو بەری جادەکە شاخ و دۆڵ و باخ وباخات بوو.
کەمێک دوورکەوتنەوە و لە بن درەختێکدا، ژنەکە دەستی کرد بە لێکردنەوەی پەڕە بە پەڕەی جلەکانی بەریی، مێردەکەی ووتی:کچێ تەواو خۆت ڕووت مەکەرەوە یەکێک دەمانبینێت، ئەم ناوە پێدەچێت جوتیار و باخەوانی لێبێت.

بەڵام ئازاری گازەکەی من ئارامی لێبڕی بوو. بۆیە جلی نەهێڵا بە لەشیەوە و منیش کەوتمە خوارەوە و لە ناو گژ و گیاکەدا خۆم وون کرد.
باش بوو ئەمجارەش ڕزگارم بوو، کەمێک دوورکەوتمەوە و بەقەدی درەختێکدا سەرکەوتم . لە دوورەوە سەیرم دەکردن. هەر خەریک بوون بە دوای مندا دەگەڕان،. دواتر هەندێک بۆنی یەکتریان کرد و ڕۆشتن ...

* * *



بۆ ئەوەی بزانم ئێر کوێیە، سەرکەوتم بۆ سەر لوتکەی درەختەکە. لە ناکاو درەختەکە دەستی کرد بە جوڵە جوڵو

هاوار هاوارێک، بە جۆرێک هەرگیز ناڵەو نرکەی وام نەبیست بوو . زۆر ترسام و زۆر پەشۆکام. دەستم کرد بە هەنگاونان بەرەو خوارەوە . درەختەکەش لە ناڵەو نرکەی خۆی بەردەوام بوو. زۆر بەووریاییەوە دەڕۆشتم دەت ووت:
هەموو گەڵاکان پەلامارم دەدەن. ئێرەم زۆر جیاواز بینی جیاواز لەو شتانەی تا ئێستا بینی بووم.
نزیکی قەدی درەختەکە بوومەوە . تەماشادەکەم مارێکی سووری گەورەی چاو زەق خۆی بە قەدەکەی دا ئاڵان دووە.
هەرگیز ماری وا گەورە و سەرسوڕهێنەرم نەبینی بوو.
مارەکە سەری لە من نزیککردەوە و بە دەنگێکی زۆر ناخۆش ووتی: وەرە لەگەڵمدا،
ووتم :چۆن دەتوانم بێم لەگەڵتدا، بۆ کوێم دەبەیت، لە ترسدا خەریک بوو دەبووم بەهەڵم. ووتی:وەرە سەر پشتم، بە ترسێکەوە چومە سەر پشتی لەشی مارەکە زۆر ساردبوو، قاچم هێندەی نەما بوو بیی بەستێت لەسەرمادا،
پێم سەیر بوو.!!
لە ناکاو مارەکە هەڵفڕی، هەزار خەیاڵ و ختورەی خراپ دەهات بە مێشکمدا، باشە من لە کوێم؟ من توشی چی بووم؟ تۆ بڵێی بتوانم بگەڕێمەوە بۆ ناو هاوڕێکانم.
تۆ بڵێیت: ئەمە تەڵەی ئەو ژن و مێردە نەبێت بۆ منیان دانابێت. پاش ماوەیکی کەم گەشتینە لای شاخێکی بەرز لە بن تاوێرە بەردێکدا کونێکی تێدا بوو، بردمی بە ناو

کونەکە دا، چەند زیاتر دەڕۆشتین زیاتر ترسم لێ دەنیشت. ناوەوەی کونەکە کەمە کەمە فراوان دەبوو . گەشتینە شوێنیک وەک ئەشکەوت. دیواری ئەشکەوتەکە هەموو سەرو کەلەی مرۆڤ و گیانداران بوو، چوە سەر بەردێکی گەورەو ووتی دابەزە، منیش لەسەر پشتی هاتمە خوارەوە. بەسەرسامییەوە سەیری ئەو دیمەنە ترسناکانەی سەر دیوارەکەم دەکرد.

مارەکە ووتی: گوێبگرە ئەی مێرولەی بچووک: من بۆیە تۆم هێناوە بۆ ئێرە تا بتکەم بەسیحرباز، چونکە من گەورەترین سیحربازم. دەتوانم خۆم بکەم بەشێوەی هەر گیاندارێک بمەوێت. دەتوانم هەرشتێک بمەوێت بیکەم.

ئەم ووشانە زۆر بێگانەو ترس ئامێز بوو . ووتم باشە تۆ لەم هەموو مێرو و گیاندارەدا بۆ تەنها منی هەژارت هەڵبژاردووە.

ووتی: بێ عەقڵی بچوک،

مەگەر تۆ حەزت لەوە نەبوو بچیتە ناو مرۆڤ! گوتم: بەڵێ وایە. ووتی ئیتر قسەمەکە هەرچییەکم ووت دەیکەیت: لە ڕاستی دا زۆر بەلامەوە سەیر بوو، چونکە ئەمە ئەو شتەبوو کە لێی دەترسام. بە دەنگێکی بەرز ووتی: دەمەوێت بتکەم بە مرۆڤ، ئەمەی ووت و ڕۆشت و دیار نەما.

ئەم قسەیە بۆمن تاکە پێڵاوێک بوو لە سەر سەرم دانرا، زۆر نیگەران بووم،

بڕیارم دا، هەر چۆنێک بێت،خۆم دەربازکەم لە دەستی ئەم مارە سیحربازە. دەستم کرد بە هەنگاونان، گوتم تاکو

مارەکە دیار نییە بازوو ڕابکەم لێرە و خۆم بشارمەوە، بە ناو کون و کەلە بەری ئەشکەوتەکەدا دەڕۆشتم، لە پڕ مارەکە بە شکڵێکی تر هاتەوە بەردەمم و منی خستە سەر زمانی و بردمیە ناو یەکێک لەو کەللەسەرە هەڵواسراوانەی ناو ئەشکەوتەکە.

ئیتر لێرەوە دۆزەخی من دەستی پێکرد، هاوار و ناڵە و قیژە قیژێکی ترس هێنەر لە ناو کەلەسەرەکەوە دەبیسترا، خەو وخۆراکم نەبوو، ژمارەیەکی زۆر کرمی بچوکی ڕەنگ سور لە لێواری کەلە سەرەکەدا دەهاتن و دەچوون.

هیچ ڕێیەکی ڕاکردنیش نەبوو. ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازترو بێتاقەت تر دەبووم .نزیکەی مانگێک، لەم شوێنەدا مامەوە، ئەم ماوەیەم بە هەزار ساڵ لێ تێپەڕی . هەزار تفم لە بەختی خۆم دەکرد، کە ئەو ماوەیە تەواو بوو چومە شێوەی مرۆڤێکی فەیلەسوف، خۆم لە ناو کتێب و گفتوگۆ فکرییەکاندا بینییەوە،سەری زمان و بنی زمانم ڕەخنەگرتن بوو، لە پیرۆزییەکان.

هیچ شتێک لای من پیرۆز نەبوو، جگە لە قسە ووتن بە پیرۆزییەکان، بە تەواویی پێکهاتەی ژیانم گۆڕا، هیچ هەستێکی مێرولەم تێدا نەمابوو، مرۆڤێک بووم بەردەوام گومانم بەرهەم دەهێنا، گومانێک لە پێناو گەشتن بە هەقیقەت نا . گومانێک لە پێناو گومان . ئەو ڕاستیەیی من گرنگیم پێ دەداو باسم دەکرد، ڕاستی نەبوو، ڕاستی لە شوێنێکی تر بوو، تێگەشتن لە ژیان زۆر ئاسانە، بەڵام ئێمە گەورەمان کردووە، مرۆڤەکان

دەبەینە شوێنێک، کە نازانێت لە کوێوە هاتوە و چۆن لێرەوە ڕێ دەرکات . ژیان پڕە لە خۆشی و چێژی پچڕ پچڕ، هەر ئەمەشە چییەتیی مرۆڤ دەشارێتەوە.
دروشمی ئەوەمان بەرزکردبویەوە (هەموو شتێک لە پێناو خۆت، خۆتیش لە پێناو چێژ) کێ هەیە لە بەردەم جوانییەکانی دونیا و حەزە شەهوانییەکاندا چۆکی نەشکێت. هەموو ئەو کەسانەی چۆکیان شکاوە بەختەوەرنین. ئێمە بەختەوەریمان لە مرۆڤ کڕی بە چێژێکی کاتی پەست و تورە.. گەورەترین دیاری خودا بۆ مرۆڤ چێژە، چێژ میوەی ژیانە، بەڵام ئێمە ئەم دیارییەمان خاڵی کردەوە لە چییەتیە ڕەسەنەکەی، (مرۆڤ گێلە، تواناى تێپەڕبوونى خۆى نییە. هەمیشە دیلی کێشەکانییەتی، هەر ئەمەش وایکردووە ئێمەش کێشەی بۆ دروست بکەین و یاری پێ بکەین، بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە و کەمە کەمە گێژدەبێت و دەکەوێت.
تێگەشتین و بینیمان مرۆڤ لێرە بارە ئاسۆییەکەی زیاترە لە بارە ستونییەکەی، خەوبینینەکانی زیاترە لە بیرکردنەو و خەیاڵەکانی. خواردنگەکانی زیاترە لە کتێبخانەکانی. شەوەکانی زیاترە لە ڕۆژەکانی. خۆی زیاترە لە ئەو. ئێرەی زیاترە لە وێ . هەمیشە چاوەڕێی کەسێکی ترە سەرۆکایەتی بکات. هەموو گیاندارێک خۆی دەناسێت: تەنها مرۆڤ نەبێت، کە نازانێت و ناپرسێت، ئێرە کوێیە؟ بۆ کوێ دەچم؟ دەمەوێت چی بم؟ دەمەوێت چی بکەم؟

من کە سێکی تورەو نەخۆش بووم، مارەکە زۆرجار سەردانی دەکردم، مارەکە گوتی پێم ها گوێبگرە ئەی مێرولەی بچوک..!



بیر لە بێ فەرمانی کردنم نەکەیتەوە، ئەگینا لە ناوت دەبەم چونکە پێش تۆ مێرولەیەکی ترم کرد بە مرۆڤ بەڵام زوو هەڵیان خەڵەتاند، دەستی دابووە ووڕێنەکردن منیش و خۆشی لە بیرکردبوو، ڕۆژێک سەردانی کتێبخانەکەیم کرد، تەماشادەکەم خەریکی نوسینی کتێبێکە بە ناوی ( ئاشق بوونی ڕۆبۆتەکان ) چەند دێڕێکم لە نوسینەکانی خوێندەوە

ئەم پارچەیە نوسرابوو . (بۆم دەرکەوت مرۆڤ بونەوەرێکی فەلسەفی یە، خودا لە ڕۆژی پاسلاَندا، لە سەر گوناهەکان سزامان نادات، بە ڵکو لە سەر فەلسەفە پرسیارمان لێدەکات. جیاواز لەو مرۆڤە گەوجانەی هەمیشە داوای پێناسە دەکەن، فەلسەفەچی یە؟ فەلسەفە چی یە؟
بەڵێ چی یە و چی، کێ یە و چۆنە و چۆن،کامەیە و کامە چەندە و چەن. مرۆڤ پێویستە هەمیشە بیر لە چوار شت بکاتەوە: (بیر لە خۆی بیر لە بوون بیر لە خودا بیر لە بیر). فەیلەسوفەکان هەمیشە شتێکیان هەیە نایڵێن.
منیش زۆر شت هەیە ناتوانم بیڵێم، ئەوەی ناتوانم بیڵێم لەم کتێبەدا ئاماژەی پێدەکەم، ترسی فەیلەسوف لە ترسنۆکی نییە، ترس لە عەقڵییەتێکی پێنەگەشتوو تاریک بینە، تاریکییەک شێلراو بە ڕووناکییەکی خەڵەفاو، لە ژێر لێوی هەر فەیلەسوفێک و لە ژێر نوکی هەر پێنوسێکدا، دونیایەک لە پرسیار و دونیایەک لەوەلاَمی کەمئەندام هەیە، لای ئێمەو مانان پرسیاری جوان ئاسانە!
بەلاَم وەلاَم نا...! چونکە وەلاَم ئیشی ئێمە نیە، تا ئێستا لەگەڵ زۆر کەس گفتوگۆم کردووە، دەربارەی ژیان و بوون و خودا، من دەمگوت: ئاینەکان بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی سەرچاوەی کێشەکانی مرۆڤ بوون، ئایین چی پێشکەشی ئادەمیزاد کردووە!؟ جگە لە زەلیلی. دواجار تێگەشتم، نا..! مرۆڤ خۆی زەلیلە ئەوە ئاین نییە مرۆڤ زەلیل دەکات،

ترسناكترین نەزانی. خراپترین جەهالەت، جەهالەتە لە دیندا، هیچ شتێک وەک نەزانی لە ئایندا کارەسات نانێتەوە،

هەر ئەوەندەی کۆمەڵێک گێل خۆیان کرد بە نوێنەری خودا و دەستیان دایە حەشر ونەشری مرۆڤەکان و خۆیان لە بیرچوو لە ناو چ زەلکاوێکی مەعریفی ئایینی دان، ئیتر ئەمە کارەساتەکەیە .هەموو شتێک خاڵی کۆتایی هەبێت، لە ئایین دا خاڵی کۆتایی نییە. خوداش زانستی بێسنورە، ئایینیش سنورێکی نییە بۆ دانانی خاڵ.

ئەو ڕاستییەیی لە بەردەکانەوە فێربووم، ئەو ڕاستییەیی لە قوڵاییەکانی ویژدانمەوە ناسیم ئەمەیە (ئەم سەری دین باوەڕبوونە بە خودا..! ئەو سەری دین باوەڕ بوونە بە خودا.. ئەم سەری دین مرۆڤ گەورەیە ئەو سەری دین مرۆڤ گەورەیە. ئەم سەری دین بۆ ژیانە ئەو سەری دین بۆ ژیانە، ئەم سەری دین ئازادییە ئەو سەری دین ئازادییە ئەم سەری دین ئەمەیە ئەو سەری دین ئەمەیە.

ئەگەر هەر دینێک ئەمە نە بوو دین نییە، بە ڵکو ستەمکارییەکی ڕووتی بێشەرمە، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەوەش ستەمکاری ڕووتی بێشەرمە ئاینێک داوایی ئەمە بکات. ئاینێک بەم هەموو جوانی و گەورەییەیی لە چاوی کە سانێکی گرگنەوە بیناسیت. من کێشەم لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا نیە، چونکە ئەوان لە دووری وەحی و نبوەت بیردەکەنەوە، لە نزیکی ئەقڵ و دووری ڕۆح و دڵ بیردەکەنەوە، فەیلەسوفەکان فێریانکردین

کە نادادپەروەری قبوڵنەکەین بەڵام نەیشیان گەیاندین بە داد پەروەری، من دڵنیام ئەگەر وەحی و پێغەبەریان بناسیبایە بیرکردنەوە و هزرەکانیان ئاڕاستەیەکی باڵاتری وەر دەگرت، ئەو هەموو لێڵی یەی ژیانی گرتۆتەوە ڕۆشن دەبویەوە.
ئەو هەموو پرسیارەی دەکرێت، وەڵامەکانیان زۆر ئاسان دەبوو. ژیان مانایەکی فراوانتری هەبوو، مرۆڤ لەم بچوکییەتیە دەردەچوو، کە بیر تەنها لیرە بکاتەوە، بەڵکو لە مرۆڤێکی ناوچەییەوە دەبوو بە مرۆڤێکی جیهانی وە لە مرۆڤێکی جیهانییەوە دەبوو بە مرۆڤێکی گەردوونی..) مارە سیحربازەکە ووتی کە ئەمەم خوێندەوە زۆر تورە بووم، خێرا پەڕەکانی کتێبەکەم دڕاندوو گازێکی توندم لەکەللەسەری مێرولەکە گرتوو، سەریم پڕکرد لە ژەهر و تۆپاندم.
ووتی پێم ئەی مێروولەی نەگبەت ئاگات لە خۆت بێت، چونکە پاش چەند ڕۆژێکی تر، دەت نێرم بۆ شوێنێکی تر بە شێوەیەکی تر، بەڵام بەو مەرجەی گوێرایەڵ بیت.
مارەکە ڕۆشت ئەو شەوە بە ئیسراحەت خەوتم، بەیانی خەبەرم بویەوە سەیر دەکەم لە سەر دیوارێکی بەرز پاڵکەوتووم، پێم سەیر بوو باشە چۆن گەشتومەتە ئێرە، دواجار زانیم بومەتەوە بە مێرولە!؟ لە خۆشی دا نەم دەزانی چی بکەم بە دەنگی بەرز هاوارم کرد ((بژی مێرولە)) ((من مێرولەم و نابم بە مرۆڤ)) ((نەفرەت لە مرۆڤ )) نەفرەت لە گشت مارە سیحربازەکانی دونیا ))، لە خەیاڵی خۆمدا دەم ووت:

تۆ بڵێ ئەمەش فێڵێکی تری مارەکە نەبێت ! پاشان دەستم کرد بە ڕۆشتن لەسەر دیوارەکە.

دیوارێکی بەرزی دوور و درێژ بوو. سەیرێکی خوارەوەی دیوارەکەم کرد، پڕ بوو لە کچی گەنج و پیر.. بە سەدان هەزار کچ خۆیان نوساندبوو بەم دیوارەوە و وێنەیان لەسەر دەکێشا و شعریان لەسەر دەنوسی و دڵ و تیریان دروست دەکرد.

هەندێکیان دەچونە سەر پشتی یەکتر بەمەبەستی سەرکەوتن بەسەر دیوارەکەدا، بەڵام لەبەر بەرزی دیوارەکە جگە لەهەوڵێکی ناکام هیچی تر نەبوو، ئەم شوێنە دوور بوو لە هەموو ئاوەدانیەک، زیاتر لە دوورگەیەکی گەورەی جێماو دەچوو.

سەیرێکی ئەو دیوی تری دیوارەکەم کرد، زۆر سەرسام بووم چونکە بەهەمان شێوە ئەو دیویش پڕ بوو لە کوڕی گەنج و پیر ئەوانیش خۆیان نوساندبو بە دیوارەکەوە و هەر یەکەی خەریکی شتێک بوو. یەک دوو مێرولەم بینی لەسەر دیوارەکە لێم پرسین ئێرە کوێ یە؟ ئەم دیوارە بەرزە چی یە؟ یەکێک لە مێرولەکان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین وەڵامی دامەوە. ووتی: ئێرە..

........................

....................................

!!!؟؟.......................

# مێروولەیەک. لە ڕێی زانکۆ ...

هیچ شتێک لەوە جوانتر نیە،

دایکت ببینی پێ دەکەنێت

زۆر وەڕس و بێتاقەت، بێزار لە هەموو شتە بیسراو بینراوەکانی دونیا، بە کۆمەڵێک خەیاڵاتی ماندوکەرەوە، چومە ژورەکەی خۆم، دەرگام داخست و لەسەر پشت لێی ڕاکشام، دەنگی هەناسە قوڵەکانم کە لە ونبوترین پێچی سیەکانمەوە ئەهات. لە ناو ماڵەکەدا دەنگی ئەدایەوە.
(دەتگوت کەسێک کەوتۆتە شوێنم و لەم ماڵەدا خۆم شاردۆتەوە) دایکم لە مەتبەخەکەوە گوێی لە دەنگی هەناسە هەڵکێشانەکەم بوو. بەپەلە وەک و ئەوەی شتێک ڕوی دابێت، زانی هاتومەتەوەو حاڵم باش نییە، بە ئەسپایی دای لە دەرگاو هاتە ژورەکەم.
بە دڵێکی پڕ لە حەسرەتەوە وتی: کوڕم چیتە. .شتێک بووە؟! بۆ وا لێرە بەبێ دەنگی کەوتوییت و قسە ناکەیت.
(هەرگیز دایکم بەو شێوەیە نەی بینیبووم)
هەڵسامەوە و ووتم : دایەگیان : نا هیچ نەبووە ...
لەسەر جێگاکەم دانیشت، دەم و چاوی گۆڕابوو، زانیم زۆر بۆم پەرۆشە، دەستم کردە ملی و ئەویش سەرمی نا بەسنگییەوە، وەک ساواترین منداڵ ماچی ئەکردم.
دایکم گوتی: کوڕم .. دایکت بە قوربانت بێت، بۆ وا بێزارو بێ تاقەتی، ئەگەر شتێک هەیە بە منیش بڵێ، بزانم چ کچێک چ کوڕێک لە زانکۆ دڵیان ئازار داوییت.
حەز ناکەم بەو شێوەیە بتبینم.گوتم: دایەگیان: بە ساقەی ئەو ڕۆحەت بم، هیچ نییە، کوڕی چی و شتی چی!!

ته‌نها شتێكی بچوكه‌ چه‌ند ساتێكی كه‌مه‌ بیری داگیركردووم.
- گوتی: دایكت به‌قوربانت بێت ..ئه‌و شته‌ بچوكه‌ چی یه‌ كه‌وا دڵی ئازار داوی و خه‌می بۆ ده‌خۆییت؟!
- گوتم: دایه‌گیان : ( مێروله‌كه‌ ) بێتاقه‌تی كردووم..!!
- دایكم به‌ بزه‌یه‌كه‌وه‌ وتی : مێرووله‌...!!؟
- گوتم دایه‌ گیان : به‌ڵێ . مێروله‌.. كه‌مێك گوێبگره‌ با بۆت باس بكه‌م :

( كاتژمێرێك له‌مه‌و پێش دوای ئه‌وه‌ی له‌ محازه‌ره‌، ته‌واو بوین، له‌ ده‌رگای زانكۆ هاتمه‌ ده‌ره‌وه‌، له‌سه‌ر شۆسته‌كه‌ ده‌ڕۆشتم . ئه‌م ویست بۆ ماڵه‌وه‌ بێمه‌وه‌، دوای كه‌مێك ڕۆشتن مێروله‌یه‌كی عه‌جولم بینی له‌ ناوه‌ڕاستی شۆسته‌كه‌دا ده‌ڕۆیشت .

ترسام له‌وه‌ی یه‌كێك پێی پیابنێت، خێرا چه‌ند لۆچێك خۆم مۆچانده‌وه‌ و ده‌ستم درێژكرد بۆی تاكو بێته‌ سه‌ر ده‌ستم . مێروله‌كه‌ قاچی پێ شه‌وه‌ی خسته‌ سه‌ر په‌نجه‌ی شایه‌تومانم: كه‌مێك وه‌ستا..!! من سه‌یری ئه‌وم ده‌كرد و ئه‌ویش سه‌یری منی ده‌كرد.

هه‌ستم كرد قسه‌م له‌گه‌ڵ ئه‌كات، به‌ڵام هیچ لێی تێنه‌گه‌شتم. پاشان ویستم به‌هه‌ردوو په‌نجه‌م بیخه‌مه‌ سه‌رده‌ستم، به‌ڵام قاچی به‌رداو به‌خێرای ڕۆشته‌ بن دیواری شۆسته‌كه‌و تێپه‌ڕی))

له‌و كاته‌وه‌ به‌رده‌وام بیر ده‌كه‌مه‌وه‌ له‌و مێروله‌ . ده‌ڵێم ده‌بێت چی به‌من ووتبێت؟! بۆ ته‌نها ته‌وقه‌ی له‌گه‌ڵ كردم؟



بۆ نەهاتە سەر دەستم؟

باشە خۆ من ئەم ویست چاكەی لەگەڵدا بكەم..؟!

دایەگیان : تەنها ئەمەیە بێ تاقەتی كردووم.

دایکم بە پێکەنینێکەوە گوتی: ئەم قسانەی تۆ لەو حیکایەتانە دەچێت، کە پێش خەوتن بۆ مندالآنی ئەلێن . منیش لەگەڵ ئەودا بزەیەکم کرد (هیچ شتێک لەو جوانتر نییە دایکت ببینیت پێ دەکەنێت)

دایکم گوتی : کوڕی خۆم . گوێبگرە: ئەگەر مێرولەکە شتێکی گوتبێت . زۆر عاقلانە: بە تۆی ووتوە: خەمی منت نەبێت من ئاگام لە خۆمە بە ووریایی یەوە دەڕۆم نایەڵم کەس پێم پیابنێت ..لە باتی من خەمی خۆتت بێت ئەی گەنج ..

# دوای
# بیست و حەوت ساڵ

ئەو بەیانییە لەگەڵ گزنگی خۆردا گەشتمە گوندەکەمان، تینویەتی چاوم بە سروشتە جوانەکەی شکا، لە ناکاو خۆم لە ناو چنارە باڵا بەرزەکان و درەختە پیرەکان و سەوزە گیا دەم بە خەندەکاندا بینیەوە.
جریوەی چۆلەکەکان مۆسیقایەکی وایی دروست کردبوو، بە ئاوازی هەموو گۆرانییەکی دەکرد. پێش ئەوەی نزیکی خانوە گڵە گوێسەبانە سەوزەکان ببمەوە، هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی، هەموو هەوایی گوندەکە هورموژیی کردە ناو سییەکانم، بە هێواشی پێڵوەکانم داخست.
فرمێسکی شادی قەد پاڵی لوتمی تێپەڕاند و بەسەر ڕیشە زبرەکانم دا جۆگەیان بەست . لە پڕ دەنگی زەنگی مەڕەکان و ئێخەو چغەی شوانی ئاواییەکە بێدەنگییەکەیان پچڕاندم.

سەگەکانی شوانەکە بەوەڕین بەرەو ڕووم هاتن. ئەگەر شوانەکە زوو فریام نەکەوتایە، دوایی بیست و حەوت ساڵ زیندانی زیندانە تاریکەکانی ڕژێمی (بەعس)ی ستەمکار دەبووم بە چەند پاروو یەکی چەوری دەمی ئەو سەگە برسیانە ...



# پەنجاو نۆ دەقیقە

ئەو ئارامیەیی لە ناو ماڵ و

خێزانەکەی خۆت دەست دەکەوێت،

لە هیچ شوێنێکی تر بۆی مەگەڕێ

سەعات (١١:٥٩) دەقیقەی شەو گەشتمەوە بەردەرگای ماڵەکەمان، کۆڵانەکەمان کش و مات بە ئەسپای دەرگای حەوشەکەم کردەوە و چومە ماڵەوە، جگە لە گڵۆپی سەردەرگای مەدخەلەکە، هەموو گڵۆپەکانی تر کوژابوویەوە، لە بەردەم دەرگاکەدا نەعلەکانی لارەی کچم بینی، هەڵمگرت و ماچم کرد. ژن و منداڵەکەم لە سەرەوە خەوت بوون، دڵم نەهات خەبەریان کەمەوە، خۆشم زۆر ماندوو بووم، هەر لە سالۆنەکەدا لەسەر قەنەفەیەک خەوتم.

بەیانی کاتێک منداڵە بچووکەکەم هاتە خوارەوە، هەر لەسەر قادرمەکەوە منی بینی، تۆزێک ڕاوەستا و گەڕایەدواوە، ووتی دایە دایەگیان ! باوکم هاتووە تەوە. بە دەنگی دەمێک گوێلێ نەبووی کچەکەم خەبەرم بوویەوە، سەیری سەعاتم کرد سەعات ( ٨:٥٩ ) دەقیقە بوو، دوای کەمێک کچەکەم بە ڕاکردن هات و باوەشی پیاداکردم، خێزانەکەشم بەو بەرزی یەوە سەیری ئەم دوو عاشقەی دەکرد، کە چۆن لە ئامێزی یە کتردا یاری ماچ ماچێن دەکەن.

سەرێکم بەرزکردەوە خێزانە کەمم بینی سەرپۆشێکی گوڵ گوڵی جوانی لە مل دا بوو، لەگەڵ پرچی ئالۆسکاو و دەمو چاوە خەواڵوەکەی دا تێکەڵ ببوو، بە ناز و مەکرێکی ژنانە هاتە خوارەوە و منیش کچەکەم لە باوەش گرت و بە رەو ڕووی ڕۆشتم، وەک ئەوەی یەکەم جاربێت یەکتری ببینین، دەستمان کردە ملی یەکتر، خێزانەکەم سەرەتا کچەکەی

ماچكردوو پاشان هەناسەی گەرمی بەر لێوم كەوت گرێک لە ڕوخسارم بەربوو، ترسام كچەكەم بسووتێنێت، سەری هەر سێكمان لە ناو ئەو زوڵفە ئاڵۆسكاوەدا وون ببوو. ئێمەی مەست، بێئاگا لە وەی كچەكەم بە باوەشەوەیە، بەو سەر پۆشەی ملی دايكی سەری هەر دووكمانی پێكەوە گرێ دا بوو ،ڕۆژێكی زۆر خۆش بوو.

نانی بە یانی مان پێكەوە خوارد، لەسەر سفرە زۆر پێكەنین، تەوای كون و قوژبنی ماڵكە پڕ ببو لە خەندەو خۆشی. لە دڵی خۆمدا دەم ووت ئەو ئارامییەی لەناو ماڵ و خێزانەكەی خۆت دەست دەكەوێت، لە هیچ شوێنێكی كە بۆی مەگەڕێ. لە ڕواڵەت دا دڵ خۆش و لە ناخدا هەستم بە شەرمەزاری دەكرد بە رامبەر ژن و منداڵەكەم . دوای دوو هەفتە ڕۆشتنم بۆ یەكێک لەم ووڵاتانەی دراوسێ، لەگەڵ یەک دوو برادەری خۆم، بێز لەو ساتانە دەكەمەوە كە لەو سەفەرەدا بەسەرمان برد، دوور لە خێزان و منداڵە چاو گەشەكانمان خەریكی كڕینی گوناە و كاری ناشیرین بوین.

كاتێک خێزانەكەم لێی پرسیم؟ سەفەرێكی خۆشبوو؟ موچڕكەیەک بە پێما هات لە تەوقە سەرمەوە دەرچوو!، بە دەمو چاوێكی درۆزنانە، وەڵامێكی ساردم دایەوە، ووتم: بەڵێ، ئیشەڵا جارێک ئێوەش دەبەم.

( پارە كردبوومی بە دەعبایەكی سەیر، هەموو كەسم بە نۆكەری خۆم دەزانی. كوڕی تاقانەی باوكم بووم، نەم توانی

خوێندن تەواوکەم، هەموو شتێکم لە بەر دەست بوو، باوکم پیاوێکی دیندار و دەوڵەمەند بوو. ئەو ژنەی ئێستا خێزانمە حەزمان لە یەک بوو، هەرئەو پەیوەندیەش وای کرد خوێندنم پێ تەواو نەکرێت. هەنێ جار خۆش بەخت و هەندێکجار شەڕ و عاجزی دەبێت لە نێوانمان.

ووتم بە ژنەکەم براکەت قەرزەکەی هێنایەوە ؟ ووتی : نەخێر، پەلەت چی یە جارێ، هەر دەی هێنێتەوە. بەبەرچاوی ئەو ژنە بەستەزمانەوە، جوێنێکی زۆرم پێدا و ووتم :

خوێڕی وا بۆ ئەو قەرزە نایەنێتەوە، دیارە خەریکی سەر سەری یە. بە جۆرێکی وا توڕەبووم ئەووت دینار نییە لە باخەڵما.

خۆم شۆردو لە حەمام هاتمە دەرەوە، لەبەردەم ئاوێنەی بەر مەغسەلەکەدا سەرم ووشک دەکردەوە، تەلەفوونێکم بۆ هات، کچەکەم موبایلەکەی بۆ هێنام، سەیری سەعاتم کرد سەعات ٥٩ :١١)، بوو، زۆر پەشۆکام بە پەلە سواری سەیارەکەم بووم و ڕۆشتم، پاش کەمێک گەشتمە نەخۆشخانەی گشتی شار، نزیکەی سی پلیکانم بڕی و بە شەش حەوت دەرگادا تێپەڕیم، لە پڕ خوشکەکەمم بینی لەگەڵ دکتۆرێک قسەی دەکرد، چووم بۆلایان و خوشکەکەم گریا کەمنی بینی، ووتی: باوکم !! ووتم دکتۆرگیان چییەتی حاڵی باوکم چۆنە، ووتی هیچ نیە ئارامبن.

چووینە ژورەوە بۆ لای باوکم، سەریم ماچ کرد . چاوەکانم لێڵ ببوو بە فرمێسک، باوکم ئۆکسجینی لە لووت دا بوو، نەی

دەتوانی قسەبکات، سوێند بەخوا چاوەکانی هێندە گەش و جوان بوو، دەتگوت پێ دەکەنێت. کە منی بینی دڵخۆش بوو، ( لە دڵی خۆم دا دەم ووت بابە گیان نەم توانی کوڕێکی باشبم بۆت )، بە پەنجەی دەستەکانی ئاماژەی کرد، کە دەیەوێت شتێک بنوسێت . وەرەقەو قەڵمم بۆ هێنا، سەیرێکی سەعاتم کرد، سەعات ٢:٥٩ بوو.



(نووسی کوڕی خۆم توخوا ئاگات لەو نامەیەبێت کە لە ناو کتێبخانەکەدا لە ناو بەینی یەکێک لە کتێبەکاندا دام ناوە، ئەگەر ئەمەم بە گوێ بکەیت گەردنت ئازا دەکەم).
دوای دوو ڕۆژ سەعات ٤:٥٩ دەقیقەی بەیانی باوکم ماڵئاوای لێکردین.
(چ دیمەنێکە بە بەرچاوتەوە فریشتەی گیان کێشان، ڕۆحی باوکت یان دایکت دەرکێشێ و بیبات).
چەند ڕۆژێک مەشغوڵ بوین بە تاعزێو میوانەوە، ئاگام لە نوسینەکەی باوکم نەما، دوای دوو هەفتە بیرم کەوتەوە، بەپەلە ڕۆشتم سەیرێکی کتێبخانەکەم کرد، یەک دوو کتێب و دەفتەرێک نەبێت هیچی تری تێدا نەمابوو .زۆر سەرسام بووم، باشە ئەو هەموو کتێبە چی بەسەرهات، چۆڵی کتێبخانەکە دووبارە زامی مردنی باوکمی کولاندەوە و دڵم پڕبوو، ئەو کتێبخانەی کە تا دوێنێ پڕبوو لە مامۆستا و قوتابی و خەڵکی ڕۆشنبیر، ئێستا چۆڵ و بێناز .
سەیرێکی سەعاتی ژوورەکەم کرد لە سەعات شەشو پەنجاونۆ دەقیقە وەستا بوو،
(خوایە گیان مرۆڤ چەند لاوازە، ژیان چەند خێرا چرکەکانی خۆمان لێدەکرێت و دەی بات، زۆر بەی ئەو شتانەی لە دەوروبەرمان ڕوودەدەن بە خواستی ئێمە نیین، ئادەمیزاد دێتە دوونیا ودەڕوات هێشتا پێناسەی خۆی نازانێت)
یەکسەر چووم بۆلای مامم، چونکە خووشکەکەم ووتی مامت

کتێبەکانی گشتی داوە بە مزگەوت . زۆر تورە بووم، ووتم مامە گیان، بۆ ئەم کارەت کرد، خۆ هێشتا باوکم کفنەکەی زەرد نەبووە، ووتی : کورم بۆ ئەو کتێبانە بە بەلاش لەو یابن، با یەکێک ئیسفادەیەکیان لێبکات خێرکی بۆ باوکت هە بێت.

نەم دەزانی چی بکەم . کتێبەکانی دابەش کردبوو بەسەر سێ مزگەوتدا، دوای شانزە ساڵ دووریم لە مزگەوت، چوومە یەکێک لە مزگەوتەکان، سەیرمکرد زۆر قورسە ناسینەوەی کتێبەکانی باوکم لە ناو ئەو هەموو قورئان و کتێبە دیینیانەدا، زۆر کتێبم هەڵدایەوە لاپەڕ بە لاپەڕە هیچم بەدی نەکرد، بەنا ئومێدی گەڕامەوە بۆلای مامم ووتم مامە گیان : هیچ نامەو کاغەزێکت فڕێ نەداوە یان بەرچاوت کەو تبێت،

ووتی نەخێر کورم کاغەز و نامەی چی، پێم بڵێ بۆچی دەگەڕێیت، ووتم بۆ هیچ مامە گیان.

* * *

چومە مزگەوتێکی تر، زۆر هەستم بە ترس دەکرد، چوومە ژوورەوە، بینیم یەک دوو کوڕی گەنج قورئانیان دەخوێند لەگەڵ پیاوێکی ڕیش ماش و برنجی . بەشەرمێکەوە سەلامم کرد هێندە نزم بوو سەلامەکەم، گوێیان لێنەبوو جوابیان

نەدامەوە. وتم با خێرا بگەڕێم بەناو کتێبەکاندا نەوەک ئێستا کاتی نوێژ بێت، سەیری سەعاتم کرد سەعات ٣:٥٩ دەقیقە بوو .لەم کاتە دا موچڕکەیەک بە لەشم دا هات، هەموو پەنجا و نۆ دەقیقەکانی ئەم یەک دوو هەفتەیەم گشتی هاتەوە یاد.
ووتم : خوایە گیان ئەمە چ ڕێکەوتێکە، من هەر کە سەیری سەعات دەکەم لەکاتە جیاوازەکاندا، سەعات ئەوەندەو پەنجاو نۆ دەقیقەیە.

خۆشم لەم نهێنییە تێ نەدەگەشتم، بەڵام هەستم کرد شتێک هەیە. کتێبەکانم هەموو دەرهێنا و سەیرم کرد، هیچم نەدۆزی یەوە، لە تاو مشەوەشی لە بیرم چو کتێبەکان بخەمەوە جێی خۆی، پیاوەکەی ناو مزگەوتەکە ووتی:مامۆستا گیان:

ئەو کتێبانە کۆ ناکەیتەوە گووناحە هەموو قورئان و حەدیسە، ووتم باشە مامەگیان . زۆر بە تێکەڵی خەریک بوو کۆم دەکردەوە، ووردە ووردە مزگەوتەکە پڕ بوو لە نوێژخوێن، یەکێک لەو گەنجانەی قورئانی دەخوێند بانگی دا. یەک دوو برادەری کۆنم لەو مزگەوتە بینیمیان و سەرە خۆشی یان لێکردم . بە لایانەوە سەیر بوو من لە وێ بووم، بەبێ دەست نوێژ، نوێژم لەگەڵ ئەوان کرد .

ڕۆشتم بۆ مزگەوتی سێ یەم، خوایەگیان لەم مزگەوتە دا بیدۆزمەوە. باش بوو کتێبەکانی ئەمزگەوتە کەم بوون، پێنجەم کتێبم سەیرکرد، پەڕەکانی کۆن و شەرحی حەدیس بوو، لە لاپەڕەی (٢٥٩) دا، دووپەڕەی دەست نووسم بینی،

لە ناو زەرفێکی نامەدا خێرا خوێندمەوە، ناسیمەوە خەتی باوکم. نووسرابوو (وەسێتی من بۆ تۆ و نەوەکانت خوێندنەوە و بڵاو کردنەوەی ئەو ووتە جوان و قەشەنگانەیە کە خەتم هێناوە بە ژێر گرنگترین یاندا، سەیری ئەو کتێبە بکەیت، کە دەست نیشانی دێڕە گرنگەکانیم کردووە، کتێبەکە لەناو یە کێک لە تاکەکانی ناو کتێبخانەکەدایە، ئەگەر چی سەرەتا باش تێناگەیت، بەڵام هیوام وایە زوو تێبگەیت...).

زۆرسەرسامانە ووتم ئەمەچی یە خوایەگیان !!، من بە تەمای چی بووم ئێستا چی دەبینم، کتێبی چی و شتی چی من چی لە کتێب بکەم !؟؟.

بەپەلە چوومە ماڵی باوکم، لە یەکێک لە تاکەکانی ناو کتێبخانەکەدا، جانتایەکی تێدابوو، خێرا کردمەوە، کڵاوێکی گوڵسەوزی حاجی و تەسبیحێک و کتێبێکی گەورەی بەرگ سووری تیابوو. نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو، نوسرابوو ( (ووتەکان ) ) ئەم کتێبە یەکەم جارم بوو بیبینم.

دەستم دایە کتێبەکەو هەڵم گرت، لە سەر کورسی یەک دانیشتم ووتم ئێستا ئەو دێڕانە دەخوێنمەوە کە خەتی هاتوە بە ژێری دا . یەکەم پەڕەم کردەوە هەموو دێڕەکان خەتی هاتبوو بە ژێری دا، دووەم پەڕەو سێیەم پەڕەش بە هەمان شێوە، پەنجاو نۆ هەمین پەڕەم کردەوە ئەویش خەتی هاتبوو بەژێر گشتی دا، سەیرم کرد هەموو کتێبەکە خەتی هاتووە بە ژێری دا.

هەناسەیەكی قوڵم هەڵكێشا و كتێبەكەم داخست و خستمەوە ناو جانتاكەو هەڵمگرت و هێنامەوە بۆماڵەوە، خێزانەكەم ووتی نامەكەت دۆزییەوە ؟ ووتم بەڵێ. شەڵا نەم دۆزییایەتەوە، نامەی چی و شتی چی،
ئەگەر پێت بڵێم چی تیا نوسراوە، تێر پێ دەكەنیت. ووتی: ئادەی پیشانم بدە، دامە دەستی و خوێندی یەوە.
ووتی،ئەمە چ كتێبێكە .پێدە چێ لای باوكت زۆر گرنگ بوو بێت، ئەویش ئەو نامە و كتێبەی بەلاوە سەیر بوو .پاش كەمێك، وەك: ئەوەی باوكم نە نامەی نوسی بێت و نە هیچی ووتبێت . شتەكانمان خستە ناو جانتاكەو هەڵمان گرت.
دوو ڕۆژ دوای ئەوە خەوێكم بینی، لە خەوما
( كۆمەڵە منداڵێكی زۆر ڕژابونە سەر شەقامەكان و خۆپیشاندانیان دەكرد و دەگریان، خەڵكی لەم بەرو ئەو بەری شەقامەكەوە وەستا بوون و بەو منداڵانە پێدەكەنیین، بەڵام دەمبینی وردە وردە خەڵكەكە دەچوونە ناو خۆپیشاندانەكەوە. كاتێك منداڵەكان زانیان خەڵكێكی زۆر شوێنیان كەوتوون، زۆر گریان .
لە پڕێك دا پیاوێك بەسەر ئەسپێكەوە هات هەر منداڵەو نامەیەك و ئالای یە كێك لە وولاتانی دا بەدەست یانەوە، من خێزانەكەمم لەگەڵ دا بوو سەیرمان دەكردن، پاش كەمێك منداڵەكان بەرز بوونەوە بۆ ئاسمان، فرمێسكەكانیان بوو بە باران و خەڵكەكەی تەڕكرد، دیمەنێكی سەرنج ڕاكێش بوو،

بە ژنەکەمم ووت لێرە بۆستە من دەچم بۆلای ئەو پیاوەی بەسەر ئەو ئەسپەوەیە بزانم نامەیەکی لێناسێنم، بەڕاکردن چووم بۆ لای چونکە دەی ویست بڕوا، ( زۆر حەزمدەکرد بزانم ئەو نامەیە چی تێدا نوسراوە )، گەشتمە لای ووتم: مامەگیان دەتوانی نامەیەکیش بدەی بەمن، ووتی نەخێر، زۆر داوام لێکرد نەی دا پێم، پیاوەکە ڕۆشت و بە دەنگی بەرز ووتی نامەکەی باوکت !! نامەکەی باوکت !! گە ڕامەوە لای خێزانەکەم، سەیرم کرد لەوێ نەمابوو، زۆر گەڕام بە دوای دا نەم دۆزییەوە ).

لە تاو گەڕان و مشەوەشی خەبەرم بوویەوە . تەماشام کرد خێزانەکەم لەسەر جێ نوستنەکەی نەمابوو، دووجار بانگم کرد، جوابی نەبوو . چومە خوارەوە بۆ مەتبەخەکە، لە وێ بینیم بە دەما کەوت بوو لە زەوی یەکەدا، زۆر پەشۆکام زانیم حاڵی خراپە، چونکە دووگیان بوو بە منداڵێکەوە، بە پەلە بە باوەش خستمە ناو سەیارەکەو بردم بۆ نەخۆشخانە، خرایە ژووری منداڵ بوون، من لە دەرەوە چاوەڕێبووم، موبایلەکەم لە ماڵەوە لە بیر چوو بوو، لە پرسگەکە تەلەفوونێکم کرد بۆ ئاشنای خوشکم وەزعەکەم تێگەیاند، ووتم بڕۆ بۆ لای (لارە) هەر خۆیەتی لە ماڵەوە دەترسێت.

پەنجاو نۆ دەقیقە چاوەڕێم کرد، هەر دەقیقەیەک بە ساڵێک تێپەڕی لێم، چاوەکانم لە سەر کاتژمێرەکەم لانە دەبرد، چرکەکان زۆر خاو تێدە پەڕین بەرەو سەعات نۆ (تا ئێستاش

هەموو سەری سەعاتێک کە بیرم دەکەوێتەوە موچڕکەیەک بە لەشما دێت) بوو بە سعات (٩:٠٠)ی رێک و سەرێکم بەرز کردەوە، دکتۆرێک هاتە دەرەوە، بەپەلە چومەلای ووتی: کورێکی جونتان بووە، ووتم تو خوا حاڵی خێزانەکەم چۆنە، تۆزێک وەستاو گوتی: بە داخەوە خێزانەکەتان خۆتان خۆش، لە سەر ئەژنۆ کەوتم، هێندە گریام مەگەر منداڵی ئەوەندە گریابم .

(سەروەت و سامان و پارەو ماڵ چی بۆ مرۆڤ دەکەن، خوایە گیان : من چی لەو دوو منداڵە بکەم ).

ئیتر (مەرگ و مردن) بوە مۆتەکەیەک و لە خەیاڵ و مێشکم نە دەچوە دەرێ، مردن چەند بێ بەزەییانە خۆشەویستان لە یەک دەکات، هەستم کرد بەڕاستی ئێرە جێگەی ژیان نییە، مەرگ یەکسانە بە سفر بوونەوەی ژیان.

منداڵەکانم ئێستا لای ئاشنای خوشکمن، زوو زوو دەچم بۆ لایان و سەردانیان دەکەم. شەوانە دێمەوە ماڵەکەی خۆم، زۆربەی کاتەکان لە و ماڵە چۆڵەدا بە گریان بە سەردەبەم.

(نا خۆشترین کاتی مرۆڤ ئەو کاتەیە، کە ئاوات و خۆزگەیەکی زۆری هەبێت بە داهاتو، کەچی زۆر ئاسان بە بەرچاوتەوە ئەو ئاواتانە ببێت بە سەراب)

ئێوارەیەکیان زۆر ماندوبووم، لە سەرکار هاتمەوە خۆم شۆرد و خەوتم، سەعات (٧:٥٩) دەقیقە بە دەنگی جەڕەسی دەرگاکەمان خەبەرم بوویەوە، چووم دەرگابکەمەوە، سەیر

دەکەم یەک باران و تەرزەیە ناو چیمەنەکەمان پڕبووە لە تەرزە لەگەڵ ڕووناکی گڵۆپی حەوشەکەدا وەک زمڕووت دەدرەوشانەوە، لە بەهاردا لەم جۆرە تەرزەیە زۆرجار دەبارێت. ووتم : دەبێت کێ بێت بەم شەوە دەدات لە دەرگا، دەرگام کردەوە سەیر دەکەم مامم و منداڵەکانی و ئاشنای خوشکمە لەگەڵ ( مانگ و ئەستێرە ) کوڕو کچە



جوانەکەم، ووتم زوو وەرنە ژوورەوە با تەڕنەبن، کوڕە بچکۆلەکەمم لێگرتن و ماچمکرد، چاووم پڕ بوو لە ئاو.
لە ئەنجامی قسەو باس لەگەڵ مامم و ئەوان ئەوشەوە خەوەکەم بیرهاتەوە و بۆم گێڕانەوە. وون بوونی خێزانەکەم لە خەونەکە دا بە مردنی ڕاڤەمان کرد.
دوای کەمێک مامم ووتی: نامەکەی باوکت چی تیانوسرابوو، منیش بۆ مامم باسکرد، مامم و خوشکەکەشم بەم نامەیە سەرسام بوون. منیش کتێبەکەم خستە بەردەمیان، مامم ووتی: ئەمە قورئانە، ووتم نەخێر مامەگیان، ئەمە
(بەشێکە لە پەیامەکانی نور ) وابزانم تەفسیری قورئانە، هی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعید نورسی یە !؟ ...

# مامۆستا سەیرەکە..؟!

پێویستە بخوێنینەوە

نەك بۆ ئەوەی ببین بە زانا،

بەڵکو بۆ ئەوەی فێڵمان لێنەکەن

قاقای پێکەنینمان ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆشت، قسەی خۆشمان لەگەڵ یەکتر دەکرد و پێدەکەنیین. لە هۆڵی موحازەرەدا چاوەڕێی مامۆستامان دەکرد، قۆناغی چواری زانکۆ بوین، دڵمان زۆر خۆش بوو بە ژیان، دەریایەک خۆزگەو ئاواتمان بۆ ژیانی داهاتومان دانابوو، دوای چەند دەقیقەیەک مامۆستا بەدەم و چاوە عەبوسەکەیەوە خۆی کرد بە ژووردا، جانتایەکی دیبلۆماسی هەزار گیرفانی بەدەستەوە بوو، یەکێک نەیزانیبایە وای هەست دەکرد ئەو جانتایە پڕە لە فەلسەفە و حیکمەت و پڕۆژەی جوان و محازەرەی نوێ.
بە شێوازێکی ناشیرین جانتاکەی هەڵدایە سەر مێزەکەی بەردەمی، ئێمەش وورتەمان لە خۆمان بڕی بوو، هەریەکەمان چوینە شوێنێک و دانیشتین.
لە ناکاو مامۆستا دەستێکی بە توندی کێشا بە مێزەکەدا و هەڵسا، ئێمە زۆر ترساین مامۆستایەکی زۆر تورە و شێتۆکە بوو، ووتی: قوتابیە گەمژەکان ئەوە بەچی پێ دەکەنن؟ دەزانن دەنگی پێکەنینتان دەگاتە کوێ، بەوە پێی دەکەنن کە زانکۆکەتان لە پلەی کۆتای زانکۆ پێشکەوتوەکانی دونیادایە! بەوە پێ دەکەنن کە ناتوانن دوو دێڕ بنوسن لەسەر مافەکانتان، بەوە پێدەکەنن کە تائێستا دەوڵەتێکمان نییە و لە باوەشی ئەم وڵاتە خوێنمژانەدا شیر دەخۆین.
بەوە پێدەکەنن خاوەنی دەریایەک نەوتن و دینارێک نییە لە گیرفانتاندا، ئەم قسانەی دەکرد و زیاتر تورە دەبوو،

بەدەنگی بەرز دەیگوت : گ.. بە عەقڵتان ! گ.. بە بیرکردنەوەتان، گ.. بە ئامانجتان کە تەنها تێرکردنی وورگ و بن ورگتانە.! ئێمە زۆر لێی دەترساین، هەرگیز ماموٚستایی وام نەبینی بوو ! لە هیچ شتێک دەمی نەدەگێڕایەوە قسەی بە قوتابی و ماموٚستا و زانکۆ و کۆمەڵگاو حیزب و حکومەت دەووت. ئەوەی بەدڵی نەبوایە تفی لێ دەکرد.



کەس نەی دەزانی ئەم کابرایە چ کارەیەو فکرەی چی یە؟ کێ ی لە پشتە وا ئەم هەموو قسەیە دەکات و لەکەس ناترسێت!.

لە ڕاستی دا ئێمەش زۆر لێی دەترساین، هەندێک جار بە تیلەی چاو سەیری یەکتریمان دەکرد، کەس مان نەمان دەوێرا فزەیەک بکەین. پاش ئەم قسانە بە ژڵەژاویەکەوە گووتی: کەمێک چاوەڕێ بکەن ئێستا دێمەوە، هۆڵەکەی جێهێشت و هەمووومان دەستمانکرد بە پێکەنیین و سەیرکردنی مۆبایلەکانمان و خەریکی فەیسبوک و دنیا

بچوكەكەی خۆمان بوین .دوای چەند دەقیقەیەک مامۆستا لەگەڵ دوو کارمەندی پاک وخاوێنی بە زبڵدانێکی گەورەوە هاتنە ژوورەوە. زۆر پێمان سەیر بوو، هەموو لە دڵی خۆماندا دەمان ووت باشە مامۆستا دەیەوێت چی بکات .؟! مامۆستا بەدەنگێکی ناشاز ووتی: چی کتێب و دەفتەر و قەڵەمتان پێیە بیهێنن بیکەنە ناو ئەم سەلەی زبڵەوە،

( کتێبێک نەتان کات بە ئینسان ئەوە چ کتێبێکە)

زۆربەی قوتابیەکان هەستان و فەرمانەکەی مامۆستایان جێ بەجێکرد. هەرچەندم کرد من نەم توانی ئەوکارە بکەم. بۆیە زۆر تورە بووم و زۆر خۆمم بەبچوک دەهاتە پێش چاو. بە دەنگی بەرز ووتم : قوتابیەکان ئەو کارە مەکەن، بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان.

ئەم قسەی من نەبەردییەکی زۆر گەورە بوو، بۆ کەس هەبوو قسە لە قسەی مامۆستادا بکات، مامۆستا ووتی : ئەوە دەڵێی چی ئەفەندی، بێم هەڵتبگرم و بتکەمە ناو سەلەی زبڵەکەوە، لە ڕاستی دا ترسام ..! بەڵام منیش بەردەوام بووم لە قسەی خۆم، ووتم : مامۆستا ئێمە گێل نیین..!، هاوار بە بیرکردنەوەی ئێوە، تۆ جانتاکەت بخەرە سەلەی خۆڵەکەوە، چونکە ئێوەو مانان، ئێمەی ئاوا لێکردووە !!!؟؟؟..

# دوو ماچ و یەك زلـــــلـە

مرۆڤ ئەگەر باڵی هەبوایە،

هەرگیز نەدەنیشتەوە

گەڵا ڕەنگاو ڕەنگەکان بەشنە شنی هەوای تەزیوی ناو بەفرەکە گەمە و یاریان دەکرد و بەو کلۆ بەفرە میهرەبانانەی کە هەورە بزێوە چڵکنەکان بۆیان هەڵ دەدان، شەڕە بەفریان دەکرد. هەر هێندەی ئەو نوقوڵە بەفرە شەرمنننانە ماچێکی ڕوومەتی ئەم گەڵا تەنک و شل و ملانەیان ئەکرد، بە هەرەوەزی و لاشەی سەرما بردویانەوە بەرەو قوڵای باوەشی درەختەکە دەچوون، پاشان کە کەمێک گەرمیان ئەبویەوە، دەهاتنەوە بەر بەفرەکە و هەموو شاخ و داخ وکێوەکانیان پڕ ئەکرد لە ڕەنگ، (بە هەزاران گەڵای ڕەنگا و ڕەنگ بەڵێنیان بە یەکتر دابوو، کە ژیان بڕەنگێنن .)
گەڵاکان وەک پەپولە بەدەوری پەلکە زێڕینەدا تەوافیان ئەکرد و گۆرانی ( وەرزی ماچە ماچ ئەبارێ...لێوی وشکمان تەڕکە جارێ ) یان دەوتەوە.
(چەند جوانە. گڤە گڤی هەوای سەحەر بلوێر بژەنێ و کلۆ و گەڵا سەما بکەن، چەند جوانە جوانبیت جوان بناسیت جوان ببینیت).
ئێمە لەبەر کورتی گوزارشتەکانمان جوانی و جوان بینیەکانمان بۆ پێناسە ناکرێت، فێڵ بازترین ئەندامەکانی جەستە چاومانە .
( چاو ) ئێمەی مرۆڤی بچوک کردەوە، بە کەمێک بینین هەڵیخەڵەتاندین، درۆیە پێناسەکردنی جوانی، هەر شتێک پێناسەت کرد ئەوشتە دەمرێت . ئەوەی من بینیم گەلێ

جوانتربوو لە هەموو ئەو شتانەی لە پێشەنگای چاوماندا نمایش دەکرێ . درەختێکی مەزنی تاقانەی ڕەنگاڵە وەک قرتێلەیەک لە سەر سنگی بەفراوی ئەم شاخ وکێو دەشتەدا چەقی بوو . تەنها من و ئەم درەختە لێرەین، نەم دەزانی بۆ هاتووم و لێرە چی دەکەم.

سەیری دەور و بەر و ئاسمانم ئەکرد کلۆ کلۆی بەفر بەئەسپایی دەباری و هێمن هێمن لەسەر پرچی خاو و زوڵفە درێژەکانم ئەنیشتنەوە.

بلوسێکی قۆڵ کورتی سوری لێوارشینم لەبەردا بوو، وێنەی منداڵێک لەسەر پشتی ماسییەک لە ڕووی پێشەوەی نەخشا بوو. کەمە کەمە هەستم بەسەرما دەکرد، بەڵام حەزم نە دەکرد بەفرەکە خۆش بکاتەوە. چونکە کلۆ سپییەکانی سەر پرچم شێوەی تارای بوکێکی ئەنواند.

دەنگی بارینی بەفرو لەرەی مۆسیقای گەڵاکان نەبێت . هیچی کە وورتەی نایەت، هێزێک لە قوڵاییەکانی ناخمەوە بەرەو درەختەکە کێشی دەکردم، حەپەسابووم لەبەردەم جوانی یەکەیدا. هەرچەند هەنگاوێک لە درەختەکە نزیک ئەبوومەوە، نیگای چاوەکانم زیاتر لەسەر گەڵا ڕەنگاو ڕەنگەکان ئەنیشت. لەسەرمادا گۆنا ناسکەکانم سور هەڵگەڕا و خونچەی لێوەکانم خوێنی تێزابوو.

شەونمێکی دەزوولەی ئاوی دەمم لە نێوان هەردوو لێوەکانمدا یاری دەکرد. لە ناکاو ئەوەی چاوەڕێم نە دەکرد، دەنگی

مۆسیقایەکی تورە لە شێوەی زەنگدا بەر گوێم کەوت، بەپەلە نیگای چاوەکانم لەسەر گەڵاکان هەڵفڕی و کەوتە سەرکوڕێکی گەنجی تازە پێگەشتوو کە پرچێکی زەردی کاڵو چاوێکی سەوزی ئاڵی هەبوو، پۆشاکێکی وەک ئەو جلەی منی لەبەردابوو، سەیر دەکەم لەبەردەمم دا وەستاوە و دەیەوێت نزیکم بێتەوە، حەپەسابووم و زمانم گۆی نە دەکرد بڵێم تۆ کێیت و چیت ئەیەوێ لێم .لە ناکاو توند گرتمی و دەستێکی هێنا بە پرچم دا و ماچێکی قوڵی کردم. لە شەرمدا چاوەکانم داخست، هەرکە چاوم کردەوە کەس لەوێ نەمابوو.

زۆر ترسام و زۆرم پێ ناخۆش بوو. ووتم باشە ئەوە چی بوو؟ خۆ ئێرە کەسی لێ نییە! گەڕامە دواوە بە جێ پێکانی خۆمدا . تەماشم کرد بەفری سەر پرچم توابوویەوە بەگەرمی ماچەکە. دڵم پەلەپەلی دەکرد، نیگەرانییەکی زۆر دابارییە سەر ڕوخسارم.

بیرم ئەکردەوە منێکی بەشەرم و بەڕەوشت چۆن توشی ئەم کێشەیە بووم . چۆن سەیری ناو چاوی دایکم بکەم، لەکاتێکدا هێشتا شووم نەکردووە. ئەم خەیاڵانە بەناو دەروونمدا یاری دەکرد . سەرێکم بەرزکردەوە دووبارە کەوتمەوە داوی جوانی درەختەکە و هێزێکم هێنایەوە بەبەری خۆمدا و دەستم کرد بەهەنگاو نان بەرەو ڕووی درەختەکە.

کرتەکرتی بەفری ژێر قاچەکانم ببوو بە هاوڕێم لەم شوێنە

چۆڵ و بێ دەنگەدا. کەم کەم بەفر دەباری، کلۆکانیش وەک من سەیری ئەو گەڵا سەوز و سوور و شین و ئاڵتونی و پرتەقاڵی و مۆرانەیان دەکرد، کە لە جوانییەکەیاندا دەبریسکانەوە.

(هیچ شتێک لەوە خۆشتر نییە تۆ یەکەمجار شتێکی جوانت بینیبێت و کەسانی تر هێشتا نەیان بینیبێت)

پێش ئەوەی بگەمە دارەکە جارێکی تر، گەنجە پرچ زەردەکە دەرکەوتەوە! شەرم و ترسێکی زۆر سەراپای لەشمی داگیرکرد، (لە خەیاڵی خۆمدا ئەم گوت بریا نەگەڕامایەتەوە، من هەڵەیەکی گەورەم کردووە کەبەتەنها هاتووم بۆ ئێرە) ویستم ڕاکەم، بەڵام پێیەکانم بە گوێیان نەدەکردم، نەم توانی هەنگاوێک چییە بجولێم، کوڕەکەش هێواش هێواش لەمن نزیک ئەبویەوە، وەک پەیکەرێک لەبەردەستی دا وەستا بووم.

سەری لەسەرم نزیک کردەوە، بەزمانی لێوەکانمی لەیەک ترازاند و هەردوو لێوەکەی لچکاند بەلێومەوە. لەبەرئەوەی دوونیا ساردبوو، لەناو هەڵمی هەناسە و دەم و لوتماندا وون ببووین.

دوای ماوەیەک کزە بایەکی سارد زوڵفە درێژەکانی گرتم و بەرەو ئاسمان هەڵی گرتم و کوڕەکەی لێ جیاکردمەوە، هێندە بەرز بوومەوە کلۆ بەفرەکانم بەچاو بینی کە چۆن یەکەم جار لەسکی هەورەکان لە دایک دەبن و هەڵئەوەرێنە

سەر زەوی. زۆر خۆشە بەرزبونەوە بۆ ئاسمان و سەفەرکردن بەناو هەور و ئەستێرە و کاکێشانەکاندا .
(مرۆڤ ئەگەر باڵی هەبوایە هەرگیز نەدەنیشتەوە . چونکە ئەگەر کەمێک گوێ لە چرپەی ڕۆحمان بگرین تێ دەگەین کە ئێمە لە بنچینەدا خەڵکی ئێرەنین . ئێمەی ئادەمیزاد بە خواستی خۆمان نەهاتوین وە بە خواستی خۆشمان لێرە ناڕۆین تەنها چونە سەر ڕێگای (بە مرۆڤ بوون) بە خواست ویستی خۆمانە . ئەگەر مرۆڤ زوو خۆی نەگەیەنێتە ئەم هەرێمی ئینسانییەتە وەک بەد بەخترین زیندەوەری گەردوون بەرەو قوڵترین خەرەندی بوون بەردەبێتەوە).
بەم شێوەیە مەستانە لە سەر پشتی ئەم بایە دەڕۆشتم، هێواش هێواش پتر بەرزتر ئەبومەوە .ماڵئاوایم لە هەورەکان کرد. بەناو دڵی ئەستێرەکاندا سەرکەوتم. لە بەرزاییەکی بەرزەوە لە پڕ وەکو گەڵایەک وەریم و لەگەڵ کلۆ بەفرەکاندا بە سەما کردنەوە لە ئاسمانەوە بەربوینەوە و لە تەنیشت درەختە جوان و ڕەنگاو ڕەنگەکەدا نیشتینەوە.
لەترساندا گەڕامە دواوە و بڕیارم دا بچمەوە بۆ ماڵەوە. زۆر بە خێرای ڕام دەکرد بەناو بەفرەکەدا. زۆر دوور کەوتمەوە لە ناکاو ئاوڕێکم دایەوە، جوانی و درەخشانی درەختەکە باوەشی کردەوە بە ڕۆحم دا و بەرەو خۆی کێشی کردم.
بە ترسێ کەوە گەڕامەوە بۆ لای درەختەکە، (ئەگەر هەر کەسێکی تریش ئەو درەختە جوانەی ببینایە وەک من

دەچوو بۆ لای و عاشقی دەبوو ) ئەمجارەیان هێواش هێواش دەچومە پێشەوە و کەمێک ڕادەوەستام، سەیرێکی ئەم لاو ئەولام دەکرد، ترسی کوڕە پرچ زەردەکەم بوو بێتەوە بۆ لام.
هەموو خەم و حەز و هیوای من ئەوە بوو کە دەستێک بدەم لە گەڵا ناسک و ڕەنگا و ڕەنگەکانی ئەو درەختە، تا نزیکی درەختەکە هاتم دڵم خۆش بوو کە کوڕە پرچ زەردەکە دیار نییە، چومە تەنیشت درەختەکە وای لەو خۆشی یەیی هەستم پێکرد، چاوەکانم کرابوونەوە و لێوەکانم بزەیان دەهات لە خۆشی یدا..
دەستەکانم بەرزکردەوە بۆ گەڵا ڕەنگا و ڕەنگەکان، پێش ئەوەی دەستم بەری بکەوێت کوڕە پرچ زەردەکە هات و یەک زللەی بەتوندی لێدام و بە ئاگاهاتمەوە..



دەستم گرت بوو، بەڕوومەتمەوە گەرمی زللەکە لەژێر پەنجەکانم دا هەستم پێ دەکرد، کەمێک بیرم لە خەوەکە دەکردەوە، هیچ تێنەدەگەشتم، چونکە لە ڕاستییەوە نزیک بوو تا خەو، وام هەست دەکرد جۆرێک لە سیحرم لێکراوە..

❊ ❊ ❊

سەیرم کرد زۆربەی زۆری سەرنشینەکان خەوتبوون، نزیکەی شەش کاتژمێرە لە ناو ئەم فڕۆکەیەدایین، ئالانی هاوڕێشم لە تەنیشتمەوە لەسەر کوشنەکە خەوتبوو... پێڵوەکانی چاوی لەیەک نابو، برژانگەکانی هەرتاڵەی ڕوی کردبووە مەملەکەتێک، حەسرەتێکی قوڵ و غەزەبێکی ڕەش لە ڕوخساری ماندویەوە ئەبینرا، عەینەکێکی ڕەشی جام گەورە لەسەر پرچە جێڵاوی و کرێماوییەکەی ناو سەری چەقی بوو .

لەگەڵ کراسێکی زەردی تۆخ کە هیچ لەگەڵ ئەم دەم وچاوەی دا نەدەگونجا، بەم سەرو سیما و گەڵو گیپاڵەوە، لە ئەکتەری شانۆیەک دەچوو کەهیچ حەزی لە ڕۆڵەکەی نەبێت و بۆ دەرفەتێک بگەڕێت تۆڵە لە دەرهێنەرەکەی بکاتەوە. هەر کەسەیرم دەکرد، لە دڵی خۆمدا ئەم گوت :بەڕاستی ئێمە دوو کەسی بەد بەختیین، چەند جارێک بانگم کرد هەستە لەخەو ئەزانی لە کەیەوە خەوتوی،

هەستە : وا گەشتینە نشینگەکە. بە باوێشک دانێک داچڵەکی و هەستا لە خەو، بەشپرزەییەکەوە گوتی : گەشتیین؟ پاشان دەبە ئاوەکەی هەڵگرت و ڕۆی کردە ناو گەرووی و سیەکانی پڕکرد لە هەوای هەناسە هەڵکێشانێک.

وورتە وورتێکی خۆشی هێنەر کەوتە ناو نەفەرەکان .هیچ شتێک لەوە خۆشتر نییە کە بگەڕێیتەوە لە یەکەم سەفەر بۆ نیشتیمان، ئەم وورتە وورتە خۆشی گەشتنەوە بوو بەنیشتیمان، بەشار، بە دایک و باوک بە ژن و منداڵ و هاوڕێکان.

هەستێکی سەیرە مرۆڤ کە ئەگەڕێتەوە بۆ وولاتەکەی واهەست دەکات هەموو خەڵکی شار هاتوون بۆ پێشوازی و چاوەڕێی دابەزینی ئەو دەکەن.

بەڵام هەر کە لە فڕۆکەکە دادەبەزییت، تێدەگەی لەوەی کە بوونی تۆ لەو مێرولە ئەچێت کە لە شارەکەی دوورکەوتبێتەوە و ڕێی کەوتبێتە دارستانێکی دوور و کەس بۆی نەگەڕێت و هەواڵی نەزانێت.

ئێمەی مرۆڤ کە لە وولاتەکەمان دوور دەکەوینەوە، چەندە خاکەکەمان خۆش دەوێیت و چەندە ڕێز لە هاونیشتمانەکەمان دەگرین ئەگەر لە کوچەیەکدا بیبینین، کەچی لە شارەکەی خۆمان لەگەڵ براکەماندا لە سەر شتێکی زۆر بێ نرخ بەساڵ قسە ناکەین و کێشەیەکیشمان نییە!.

کاتژمێر دە و پەنجاو نۆ دەقیقەی شەو گەشتینە نشینگەکە و دابەزین و جانتاکانمان لەگەڵ خۆمان هێنا . کزەبایەکی سارد باوەشی کرد بە لەشماندا و چەند جارێک پەلاماری جانتاکانی دەدایین بەنیازبوو بۆ مان هەڵبگرێت .

لەم کاتەدا سەیرێکی ئاسمانم کرد ئەستێرەکان بە هەورەکان خۆیان داپۆشی بوو، لە ئالانی هاوڕێم پرسی دەزانی کە ئەستێرەکانیش بەبینینمان دڵ خۆش نیین . ئەگەر لەبەر ڕووگیری نە بووایە پۆلیسەکانی ئێشکگرو هەموو ئەو خەڵکەی هاتبوون بۆ پێشوازی کەس و کاریان یەک بەیەک ماچم دەکردن.

تا نەچیتە دەرەوە نازانی کە نیشتیمانەکەت چەندە شیرینە و خەڵکەکەی چەندە خۆشەویستە . ئێستا بە چاوێکی تر و بینینێکی جوانتر شار و شەقام و بازاڕ و مەردوومەکانی ناوی ئەبینیت.

لە لایەک دڵخۆشیت کە گەڕاویتەوە و لە لایەک خەم باری کە نیشتیمانەکەت هێشتا شوێنەواری تەپو تۆزی جەنگ و خوێنی پێوە دیارە، وولاتانی تریش لە ناو کەیف و شادی خانوە شوشەییەکانیادا دێن و دەچن و سەرقاڵی ژیانکردنن. ئەم داڵغە و خەیاڵانە وەک ژانی ئازارێک بە ناو مێشکم دا دەهات.

* * *

ئێمە دوو خوێنکار بووین، بۆ خوێندن چوو بوینە دەرەوە، پێشتر سەفەرمان نەکردبوو. هەرچەند پێشتر یەکتریمان باش نە دەناسی بەڵام پێویست بوو ببین بە هاوڕێ وەک دوو خوێنکاری کورد. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر نزیک دەبوویینەوە لە یەکتر . ڕۆژ بە ڕۆژ شتی نوێمان دەبیست و شتی نوێمان دەبینی لەم وولاتە . ڕۆژ بە ڕۆژ کانیاوی پرسیار و گومانمان بەرامبەر بەخۆمان بەئێوە بەئێرە بەئەوێ بەژیان دەتەقی و بە ناو مێشک و دەروونماندا فوارەی دەکرد . لە هیچ شتێک تێ نەدەگەشتین،.

ئەو ئامانجەی ئێمەی هێنا بوو بۆ ئەم شارە بێ مانا تریین ئامانج بوو لێرە. کەوتبووینە ناو سەدان دوونیایی جیاوازەوە. ئێمە لەو سەفەرەماندا وولاتی زۆر گەڕایین . زۆر کەسمان بینی، (هیچ بونەوەرێک هێندەی مرۆڤ زوو خۆی ناگونجێنێت لەگەڵ ئەو ژینگەیەیی تێیدا دەژی، هەر ئەمەش وای لێکردووە سەفەر نەکات ..)

دوای دووساڵ بە کۆمەڵێک پرسیاری زۆرەوە لە سەر بوون لەسەر مرۆڤ لەسەر ژیان هاتینەوە بۆ کوردستان. لێرە لەم نیشتیمانە پرسیارکردن لە هەموو شتێک هەیە: وەک: بۆ ژن ناهێنیت؟ بۆ شوناکەیت؟ بۆ منداڵتان نابێت؟ موچەکەت چەندە؟ لە چ کۆلێژێکی؟ ئەو ماشێنەت بەچەند کڕی؟چ کرێمێک دەدەی لە دەم و چاووت ؟سەلاجەتان هەیە؟.!!!

بەڵام ئەوەی لێرە نییە ( پرسیارە ) ئێمە هاتین پرسیار

دروست بکەین، خەڵکی فێری پرسیار بکەین .
قورسترین شت ئەوەیە پرسیار لای خەڵک دروست بکەیت .!
من و ئالان سەرەتا دەستمان کرد بە دروستکردنی چەند کارێکی هونەری وەک سەرەتایەک بۆ لە دایک بوونی پرسیار..؟؟؟
دەشمان زانی توشی چەندین گیروگرفت دەبینەوە لە لایەن کۆمەڵگاکەمانەوە..چونکە ژانی لە دایک بونی پرسیار ئاسان نییە ..!



بەيانييەک هەڵسام قۆنەرەکانم بۆيەکرد، تاکێکيان بۆيەی سور و تاکەکەی تری بۆيەی سپی چوم بۆ ناو بازاڕ ..؟ لە ناو بازاڕ خەڵکێکی زۆر سەيری دەکردم.
پاشان جوتێک گوێرەوييم کڕی و بەسەر قۆنەرەکانمدا کردمە پێم و هاتمەوە بۆ ماڵەوە . دايکم و برا و خوشکەکانم و خەڵکيش وايان دەزانی تێک چووم .
دەيان ووت کچەکەمان نارد بۆ خوێندن کەچی بە شێتی هاتەوە. تاکە بڕوانامەيەک کە هێنابومەوە و دڵم پێی خۆش بوو : بڕوانامەی شێتی بوو : هەموو مرۆڤە ژيرەکان ڕۆژێ لە ڕۆژان پێيان دەڵێن شێت : بەڵام خەڵکی نازانێت سەردەمی زێڕينی مرۆڤە ژيرەکان قۆناغی دوای شێت بوونيانە.
هەموو شێتەکانی دونيا هونەرمەندن چونکە شێوازێکی نوێ لە دونيادا دەژين جياواز لەم شێوازە لە يەکچوەی ئێمە : هيچ پێغەمبەرێک نەهاتوە پێی نەوترابێت شێت ..
هەرئەوەندەی کۆمەڵێک گێل پێيان ووتی شێت ئيتر بزانە هونەرمەنديت . زۆر جار وا پێويست دەکات لە ناو گێلەکاندا خۆت گێيێل نيشانبدەيت، بۆ ئەوەی تەريق نەبنەوە.
ئيتر بۆ ماوە مانگێک نەچومە دەرەوە، لەگەڵ ئالانی هاوڕێم دا دەستمانکرد بە دروستکردنی پەيکەری (مرۆڤێکی بێقاچی وورگ شۆڕ) لە پارکی گەل لە ناو چەقی شار دامان نا. بە جۆرێک سەری مرۆڤەکە لە خوارەوە لەسەر زەوی چەسپاندمان و وورگ و گەڵو قونی يشی بەرەو سەرەوە بوو . دوای چەند

ڕۆژێک ئەم پەیکەرە هەڵای نایەوە لە ناو خەڵک دا .هەرچی ڕۆژنامەو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بوو باس باسی ئەم پەیکەرە بوو. هەر یەکەی قسەیەکی دەکرد :

یەکێک دەی ووت: ئەم پەیکەرە پێچەوانەی دابونەریتی کۆمەڵگایە.. یان دەیان ووت ئەم پەیکەرە سوکایەتییە بە مرۆڤایەتی..

ئەم پەیکەرە سەدان پرسیاری دروستکرد : لەوانە :

(مرۆڤ ئەوەیە کە بیر دەکاتەوە یان ئەوەیەکە شەهوەتی هەیە ..؟)

(مرۆڤ عەقڵی هەبێت باشە یان عەقڵی بجولێت..؟)

(مرۆڤ چ کاتێک دەمرێت ..؟ کاتێک عەقڵی گەرم بێت: یان دڵی گەرم بێت: یان وورگی گەرم بێت : یان ناوگەڵی گەرم بێت ..؟؟)

(مرۆڤ قاچی بۆچی یە گەر سەفەر نەکات ؟)

(مرۆڤ بەختەوەر دەژی یان قالۆنچە ؟)

(ژیانی مرۆڤ خۆشترە یان ژیانی ماسی ..؟)

(ئێمە بۆیە هاتووین بژین یان بەختەوربین یان بمرین یان بزانیین یان بناسین یان بپرسین ...؟)

ئیتر ئەم پرسیارانەو دەیان پرسیاری تر هەر کەسەو لەهەمبانەی خۆیەوە شەن و کەویان دەکرد، یەکێک لە نوسەرە دەمپڕەکان خۆی شین و مۆرکردبویەوە لەسەر تەلەفزوێنە بۆ ڕکابەرەکە :دەی ووت : شەهوەت ووزەیەکی شەڕانییە، ژیان

بەم ووزە پيس و شەڕانييە دەست پێدەكات، بۆيە بە جوانی و خێر كۆتايی نايەت..!؟ مرۆڤ واتە شەهوەت، شەهوەت واتە ژيان، ژيان واتە مرۆڤ ..؟! هەر ئەم ووزەيەش سەرچاوەی شەڕ و مينەتيكانە.
بێژەرەكە پرسياری لێدەكرد :
باشە چۆن لەلايەک دەڵێيت: شەهوەت واتە ژيان..
لەلايەكی تر دەڵێيت:
شەهوەت سەرچاوەی شەڕ و خراپكارييە؟ ئەمە چ دوور و نزيكييەكی لەگەڵ پەيكەرەكەدا هەيە؟ كاتێک دەڵێين شەهوەت واتە ژيان:
مەگەر ژيان پڕنييە لە شەڕ..؟ ئەمە بەمانای دژيەک بوون نييە..! ئەو پەيكەرە پێمان دەڵێت :
ئەوەندەی ناوگەڵمان لاگرنگە ئەوەندە عەقڵمان لاگرنگ نييە..؟ ئەوەندەی ووركمان لاگرنگە ئەوەندە ڕۆحمان لا گرنگ نييە..؟ بێژەرەكە دەی پرسی يەوە :
باشە عەقڵ و ڕۆح و دڵ چ گرنگييەكيان هەيە؟ لە كاتێكدا زۆربەی زۆری خەڵكی بەدوای ئارەزووە هەنوكەييەكانيانەوەيە. ئەوش لە ڕێگای تێركردن وورگ و بنوورگەوە.
سەدان ساڵە ژيان بەم شێوەيە بووە : ڕاستە ئێمە ئەمانەوێت ئەم پرسيارە درووست بكەين ..
ئايا مرۆڤ ئەم سێ لايەنە گرنگەی وەک (عەقڵ و دڵ و ڕۆح) وونكات .ئيتر چ جياوازی يەكی دەبێت لەگەڵ

زیندەوەرەکانی تر: بەڵێ جیاوازی زۆری دەبێت: چونکە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بەم ماهییەتە وەهمیە بچوکەوە کە بۆ خۆی دروستکردوە هێندەی کرم و قالۆنچەیەک بەختەوەر بژی...؟!!



پاش ئەم کارەمان زۆر نیگەران بوین، چونکە قسەی جۆراو جۆرمان پێ دەوترا. لەهەمانکاتدا لەم ناوچەیە شەڕبوو، چەند گروپێک دروست بووبون مرۆڤیان سەردەبڕی خەڵکیان دەکوشت و بێ ڕێزییان بەخەڵک دەکرد..
هەندێکجار هەندێک کاری قیزەونی وام دەبینی لێیان بێزم لە مرۆڤ بوونی خۆم دەکردەوە ..بەیانییەکیان سێ چوار قوتوی بۆیەم برد و چومە سەر یەکێک لە شەقامە قەرەباڵغەکانی شارو لەسەر مەنۆڵی ئاوەڕۆکانی ئەو شەقامە دەستمکرد بە دروستکردنی وێنەی سەری مرۆڤ:
خەڵک لە دەورم کۆبویەوەو سەیریاندەکردم دەیان پرسی ئەمە چی دەکات؟ خەریکی چی یە؟ منیش هیچ قسەم نەدەکرد ..
ئەم کارەش بوو بەدەنگۆی ناو خەڵک: هەر کەسەو بە جۆرێ دەی ڕوانییە ئەم کارە هونەرییە:
تانە و قسەو قسەڵۆک و ناو ناتۆرەی زۆریان خستە دوامان:
من زۆر بێزار بووم : ڕۆژێکیان بەتەواوی تورە بووم : بەرامبەر هەموو شتێک : چومە ژوورەکەی خۆم و بەرامبەر ئاوێنەیەک وەستام : دڵم پڕبوو دەستم کرد بەگریان : بەخۆمم دەووت چەند ناشیرینە مرۆڤێک مرۆڤێکی تر بکوژێت، چەند دزێوە مرۆڤێک بێ ڕێزی بەمرۆڤێک بکات ..! لەگەڵ خۆم ئەدوام و خەیاڵەکانم ئەی بردم بەناو ئەو دیمەنە ترسناک وەحشی گەریانەی ئەو گروپە مرۆڤ خۆرە دڕندانە کە چۆن بێڕێزی

بەمرۆڤ دەکەن : بۆیە بەخۆمم دەووت : لەهەر شوێنێک بێ ڕێزی بە مرۆڤ کرا ئەو شوێنە ئاودەسخانەیە . پێویستە بە ڕووتی بێینەدەرەوە و بە دوای دەریادا بگەڕێین.
من دەم ویست بەم کارەم پرسیارێک دروستبکەم : بەڵام جگە لە پرسیاری بچوک هیچ پرسیارێکی تری دروست نەکرد، مرۆڤی بچوک پرسیاری بچوک دەکات..؟!
(کاتێک سەری مەنۆڵ و سەری مرۆڤ جیاوازی نامێنێت ئیتر زیندووبونەوەی دەی ناسۆرە مرۆڤ خۆرەکان کارێکی ئاسانە)
یەکێک لە کێشەگەورەکانی مرۆڤ ئەوەیە لەوەتەی هەیە خەریکی دروستکردنی ئاودەستخانەیە .بەتایبەتی ئاودەستخانەی هزری پڕگیر.

* * *

ئالان تەلەفونی بۆ کردم هەستی کرد بێتاقەتم : ووتم دەمەوێت بت بینم: لە کافتریای گەنجان یەکترییمانبینی سەر و نیسکافەیەکمان خوارد .
باسی وەزعی خۆمم بۆکرد، من ماوەیەکە خەوی زۆر دەبینم، هەر کە چاو دادەخەم دەچمە جیهانێکی دیکەوە ..بەڵام ئەو ڕۆژەی کە هاتینەوە لە فڕۆکەکەدا خەونێکی سەیرم بینی، زۆر دەترسم، وابزانم پەیوەندی بە تۆشەوە هەیە، کە زۆر

جار پێکەوەین، پێکەنی ووتی : وام زانی باسی کاری هونەری و تانە و تەشەرەکانی خەڵکی دەکەیت..! منیش بەڕاست خەوەکەم بۆ گێڕایەوە. ئالانیش کە مێک پێی سەیر بوو . دەی ووت : ئەو کوڕە پرچ زەردە من نەبم . پێدەکەنی..؟!! ووتی پێم تۆ لەوە گەڕێ ..دوای دەچین بۆ لای باوکم : ئەو لەو خەو و شتانە سەری دەردەچێت ..
زۆر بیری لێمەکەرەوە ..هیچ نییە .
ووتم : ئالان . زۆر باشە من بیرم لە شتێک کردۆتەوە، وەک دەزانیت هەموو گەنجان و خوێنکاران خوویان داوەتە ئەم ئەنتەرنێت و مەنتەرنێتە ..کەس ناخوێنێتەوە..
کتێبیش بوە بە شتێکی نامۆ . جا بۆیە دەڵێم: با لەگەڵ کۆمەڵێک گەنج و هونەرمەند و ڕۆشنبیری خوێنەواردا، چەند چالاکی یەک ساز بکەین .سەرەتا بە خۆپیشاندانێک دەست پێبکەین کە هەر یەکەمان کتێبێکمان بەدەستەوەبێت و بەرزمان کردبێتەوە. لەگەڵ چەند دروشمێک . ڕاکەی منی زۆر لا پەسەند بوو..
دەستمانکرد بە ئامادەکاری. دوای هەفتەیەک نزیکەی دووسەد گەنج کۆبوینەوە، گروپێکی میوزیکی بچوک لەگەڵ مان بوو . بە هێمەنی میوزیکیان دەژەند و ئێمەش یەکی بە کتێبێکەوە بەبێ دەنگی بەناو بازاڕدا دەڕۆشتین . ئەمە دروشمەکانمان بوو: ( پێویستە بخوێنینەوە نەک بۆ ئەوەی ببین بە زانا،بەڵکو بۆ ئەوەی فێڵمان لێ نەکەن .)

(بە خوێندنەوە چاومان دەكرێتەوە و جوانیەكان دەبینین)
( هەرگیز ئەنتەرنێت جێگەی پەرتوک ناگرێتەوە )
( بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکانما بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانەبێت: پێویستە پەرتوک بخوێنینەوە )
( ژیانی ئەم دوونیایە هەموو خەون وخەیاڵ و پوچی یە، تەنها ئەوانەی دەخوێننەوە، دەتوانن ئەم خەون و خەیاڵانە بکەن بە ڕاستی و ئەم پوچی یە تێک بشکێنن )
( با بخوێنینەوە تا ( ژیان ) فێرببین)
(خوێندنەوە پێویستە، تا جەهالەت نەمان خنكێنێت)... لە سەر شەقامێک کە خەڵکێکی زۆری لێ بوو شانۆیی یەکمان پێشکەش کرد:
(کێکێکی گەورە لە شێوەی کتێبدا دروستکرابوو ..!! چەند کەسێک بەدەوری کێکەکەدا دەسوڕانەوە، زۆریان برسی بوو.. نەیان دەزانی ئەوە کێکە ..لەگەڵ یەکتردا قسەیان بەیەکتر دەگوت و بۆڵە بۆڵو گلەی یان لە یەکتری دەکرد..
وە لەیەکتریش تێ نەدەگەشتن . بە ناو یەکدا هات و چۆیان دەکرد . بەدوای دەروازەیەک دا دەگەڕان ..
تا لەم برسێتی یە ڕزگاریان بێت. پاش کەمێک پیاوێک بە چاکەت و پانتۆڵ و بۆنباخەو دێت و دەڵێت:
ئێوە بۆیە ئەم هەموو بۆڵە بۆڵە دەکەن چونکە برسی تانە.. ئایا نازانن ..ئەوەی لە تەنیشتانەوەیە کێکە..!!؟



پياوەكە بە پێنوسێكی تايبەت كێكەكە دەشكێنێت و يەكی پارچەيەكيان پێدەدات. ئيتر تێر دەخۆن و لەگەڵ يەكتر دەبن بە براو بە خۆشەويستی دەژين ).

* * *

كاتژمێر پێنجی ئێوارە چووم بۆ ماڵی ئالان : ماڵێكی بەڕێز و ڕۆشنبير بوون، دايک وخوشكەكەی زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنيان كردم ..ئالان لە خوشكەكەی پرسی حاجی لە كتێبخانەكەيە؟ ووتی: بەڵێ لەوێيە ..

ووتی وەرە بابچین بۆلای باوکم: چومە ژوورەوە. واای چیم بینی کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ کتێب وپەرتوکی جۆرا و جۆر. بابی ئالان لە سەر کورسیەک دانیشت بوو، بە چاویلکەیەکی زەڕەبینی گەورە کتێبی
(پەیامەکانی نوری مامۆستا سەعیدی کوردی) دەخوێندەوە.
بە خێرهاتنی کردین: ئالان ووتی: حاجی ئەمە ئەو هاوڕێیەمە کە پێکەوە سەفەرمان کرد ..
نازانم :دەڵێت خەونم بینی وە. کەمێک قسەی بۆ بکە زۆر نیگەران بووە.. ووتی: کچم هیچ نییە گەنجان لەم تەمەنەی ئێوەدا خەوی سەیر سەیر دەبینن!
نیگەران مەبە چاوەکەم: ووتم مامەگیان لەم ماوەی پێشوەدا خەوێکم بینی تا ئێستاش کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەم ماوە، ئەمەوێت نهێنی و ڕازی ئەم خەوەم بزانم، چونکە جیاواز لە هەر خەوێکی تر کە مرۆڤ ئەی بینێت سەرنجی ڕاکێشاوم .
بەشەرمێکەوە دێڕ بە دێڕ خەوەکەم بۆ گێڕایەوە ..
بابی ئالان: تا بڵێیت مرۆڤێکی ڕووخۆش و میهرەبان بوو، کە سەیری ئەو ڕیشە تەنکە سپی بووەیم ئەکرد تارمای بەفری ناو خەوەکەمم ئەهاتەوە یاد .
مرۆڤی وا زۆر کەمە لەم زروف و زەمانەدا، کە وەک باوک گوێت لێبگرێت و وەک دایک فرمێسکەکانت بسڕێت .

هەر کە ئەی ووت کچەکەم: هەستم بە فێنکییەکی وا ئەکرد، دەروونمی پڕ دەکرد لە ئارامی و نەشئەی ئەوینێکی قوڵ . هەر بەڕووە خۆشەکەی و قسە هێمنەکانی ووتی: کچم : خۆ من ڕاڤەو لێکدانەوە خەون نازانم.
لە بەرئەوە بۆ هەر کەسێکی تری وەک منی باس بکەیت بەپێی بیر و بۆچونی خۆی خەو پرژێنت بۆ دەکات .یان باسی ئەو کتێبانە دەکات کە کتێبی ( خەو نامە )ن، بۆیە ووتم هیچ نییە، زۆر بیری لێمەکەرەوە، خودا بەخێری ئەگێڕێت ئیشەڵا.
بەڵام من واهەست دەکەم ئەو درەختە جوان و ڕەنگا و ڕەنگە گوزارشتە لە گوڵەکانی ناو باخچەی دڵ و کانی و تاڤگە بەخوڕەکانی ناو ڕۆح و هەموو شتە جوان و شیرین و لەتیفە ناسکەکانی قوڵای گیان و دەروونت..
بۆیە بەو هەموو هەست و شەوقەوە بەرەو ڕووی دەڕۆشتی، چونکە لە کاتی خەوتن دا مرۆڤ فیترەت و سروشتە پاکەکەی ناوخۆی باش دەناسێت.
ئەو کوڕە پرچ زەردەش ئاماژەیە بەنەفسمان، کە هەمیشە بە دوای چێژە کاتی و ڕواڵەتییەکانەوەیە، هەر ئەم نەفسەشە نایەڵێت : بۆنی گوڵەکانی ناوباخچەی ڕۆحمان بکەین.
لە پێناو چێژێکی کەمدا، دەیان ئازار و زللەمان تێدەسرەوێنێت.
گەورەترین هەڵەی مرۆڤ ئەوەیە کە لە دەرەوەی خۆی بەدوای بەختەوەریدا ئەگەڕێت. لە کاتێکدا بەختەوەری لەناو خۆماندایە ..

.مرۆڤ هەر ئەوندەی ووتی بەختەوەرم و قومێ ئاوی لەکانیاوی ڕۆحی خواردەوە .ئیتر بۆ هەمیشە دەحەوێتەوە..

* * *

من و ئالان بەردەوام بیرمان لە کاری هونەری نوێ و ناوازە دەکردەوە، ئامانجمان هێنانە دەرەوەی تاک بو لەم وەستاوی و چەق بەستوییە فکری و کلتوری و دینی و سیاسیەیی کە مرۆڤی ئەم ناوچەیە پێوەی دەناڵێنێت.
هونەر ئاسانترین شتێکە کە مرۆڤ لێ یەوە فێری پرسیار ببێت. هەر بۆیە ماوەی چەند ڕۆژێکی زۆر دوای پلانێکی تۆکمە دەستمانکرد بە دروستکردنی پەیکەرێکی گەورەی سەرنج ڕاکێش کە منداڵێکی بچوک شیری دەدا بەدایکی.
لە خوارەوەی پەیکەرەکەش ئەم دێڕەمان نوسی بوو ..
(عەقڵ ، یاسا، هەقیقەت، سێ درۆ گەورەکەی ژیان)
بەردەوام پرسیارمان دەئەفراندە مێشکی خەڵکەوە، هەمیشەش باجی ئەو کارانەمان دەدا کە دەمانکرد، چونکە لەیەکدانەوەی هەڵەیان بۆ دەکرد.
دوای سێ ڕۆژ لە پەردەلادان لەسەر پەیکەرەکە لەلایەن چەند کەسێکی نەخۆشەوە هەواڵمان پێگەشت کە پەیکەرەکەیان شکاندووە... زۆر تورەبوین .چونکە پێشتریش هەر ئەم جۆرە کەسانە پەیکەری خۆشەویستییان لە پارکی ئازادی




شکاند، ئەمانە نازانن خۆشەویستی چییە حەزیان لە تێکدانە، ئەمانە هونەر بەکوفر دەزانن.. نەخێر.. مادام خودا خۆی هونەرمەندە، ئیتر بە پێچەوانەوە هونەر نەکردن کوفرە...!!بەس کێ هەیە لەمە تێبگات !!؟. بۆ دەبێت وەک یەک بیربکەینەوە وەک یەک کار بکەین، هەر شتێک بەدڵمان

نەبوو تێکی بدەین. ئیتر ئەم پەیکەرەش وەک پەیکەرەکانی تر پرسیار گەلێکی زۆری خولقاند وەک (شتە نەزانراوەکان زیاترن لە شتە زانراوەکان، کەواتە هەقیقەت لە کویایە ..؟!) (هەقیقەت : ئەزموون ناکرێت . گومانکردن لە هەقیقەت ئەزموون دەکرێت) (یاسا گەورەترە لە مرۆڤ یان مرۆڤ گەورەترە لە یاسا).

لێرەوە قسەکردن لە سەر ( عەقڵ و یاسا و هەقیقەت ) بوو بە بنێشتە خۆشەی دەمی ڕاگەیاندنەکان، ڕۆژنامە و کەناڵەکانی ئێمە یەک هەواڵ یەک بەرنامە یەک شێوازن ..بۆ نمونە کەناڵێک بڵێت : ئەمڕۆ ژنێک چوارمنداڵی بوو ..کەناڵەکەی تەنیشتی شی دەڵێت : ئەمڕۆ ژنێک چوارمنداڵی بوو . بەم جۆرە کەناڵەکانی تریش هەمان شت دەڵێن : لەوەتەی دوونیا دروست بووە بەزم و هەرا و شەڕە، ڕاگەیاندنەکان ژیانی ئێمەیان تێکدا.

(سیاسەت سیاسەت هەواڵ هەواڵ ناشیرینی ناشیرینی ناشیرین کارەسات کارەسات).

هەموو کەناڵەکان ئەمە ئیشیانە، هەر سەری سەعاتێک گەمژەیەک دێتە سەر شاشە و مێشک و دڵ و دەرونمان پڕدەکات لە ناشیرینی و فرمێسک، هەرچی ( ماچ و پێکەنین و خۆشەویستی) بێت لە ناخماندا دەکوژێت..چونکە بە ڕاستی هەست نەکردن بە خۆشەویستی مردنێکی هێواشە.

چەند وورده بەرنامەیەکیان بۆ قسەکردن لەسەر ئەم پەیکەرە

دانا، من زۆر حەزم لە دەركوتن نييە، بەڵا ناچاربووم، شتێك هەيە پێويستە قسەی لەسەر بكەين :ئەويش ( عەقڵ و ياسا و هەقيقەت ) بوو،
ئاساييە لە هەقيقەت تێنەگەين، بەڵا ئاسايی نييە لە هەقيقەت هەڵبێين..هەقيقەتی ژيان و مردن هەقيقەتی ئێرە و ئەوێ هەقيقەتی هەقيقەت...!!؟ هەمووومان لەسەر ئەمە كۆكيين كە هەر كەسێك بەشێك هەقيقەتی لايە .
من دەڵێم هەقيقەت لای كەسمان نييە، هەقيقەت ئەگەر هەبێت لە ئاسمانە، يەک هەقيقەت هەيە ئەويش خودايە و بەس، ئەويش بۆ ئەوێ نەک بۆ ئێرە، من ناڵێم بێ هەقيقەتيين، دەڵێم هەقيقەت درۆيەكە لەناوماندا، وەک ياسا وەک عەقڵ .خۆمان دروستی دەكەين، خۆمان مانای پێدەدەين، هەقيقەت لەو شوێنەيە كەخۆمان دەمانەوێت، ياسا لەو شوێنەيە كەخۆمان دەمانەوێت، يان دەسەڵاتدارەكان دەيانەوێت، عەقڵ لەو شوێنەيە كەخۆمان دەمانەوێت..
بينينەكانمان لە خۆمانەوە بۆ خۆمان بۆ ژيان ناشيرينترين بينين و بێ ماناتريين بيركردنوەيە، هەر ئەمەش بووەتە هۆی درۆزنكردنی ( عەقڵ و ياسا و هەقيقەت )
مرۆڤ هەميشە بە دوای بەرژەوەندييەكانيەوەيەتی، ئەگەر عەقڵ جوڵەيەک بكات، هەر بەو ئاڕاستەيە دەجوڵێت، ئەوانەی مرۆڤ دەكوژن، ئەوانەی دونيا تێک دەدەن، ئەوانە كەسانی بێ عەقڵ نيين، پێتان سەير نەبێت ..! پێويستە

ئەوە بزانن كە هەرچی شەڕ و جەنگ و مەينەتيەكانە بە هۆی ( عەقڵ)ەوەيە، چونكە خاڵی لاوازی عەقڵ ئەوەيە كەمانا دەدات بە بێمانايی ..
ئێمە ئەگەر لە گۆشە نيگايی خوداوە سەيری ژيان بكەين، ئاسانتر ماناداربوونی ژيان دەبينين، وەجوان دەردەكەوێت كە ژيان بەو شێوەيەش ناشيرين نييە كە باس دەكرێت ...؟!
ژيان لێرەوە دەبێتە پێش مەرجێک بۆ ژيانێكی هەميشەيی..

* * *

ئێمە دوو پەيكەرتاشی كارامەبوين، بێجگە لە پەيكەرتاشی من هيوايەتێكی زۆرم هەبوو لەگەڵ و وێنە و مۆسيقا و ڕۆمان..ئالان زياتر حەزی لە شعر بوو ..دەستی شعرنوسينی لە ئاستێكی جوان و ناسكدا بوو .
ئالان بە نيازی گێڕانی كۆڕێكی شعری بوو لە ناو هۆڵی كتێبخانەی زانكۆ .دەستی كرد بە كاركردن، منيش هاوكاريم دەكرد : پێی ووتم : كەتی گيان پێويستە ناو نيشانێكی جوان هەڵبژێرم بۆ كۆڕەكە.. ووتی پێم : خۆم ناوێكم داناوە، بە ناوی (ئەی پەری وون تۆ لە كوێی) پێت چۆنە ؟!زۆر لام جوان و ناسک بوو..ووتم : زۆر باشە ئۆكەی ..! ووتم بە ئالان با ڕەوەز ی هاوڕێت ميوزيكێكی خۆش ئامادە بكات: زۆری بەدڵ بوو..كاتژمێر دەی بەيانی ڕۆژی يەكشەمە لە هۆڵی

**زانکۆ کۆڕە شیعرییەکە دەستی پێکرد ..! بەچەپڵە ڕێزان پێشوازییان لە دەرکەوتنی ئالانکرد..منیش لێتان ناشارمەوە هەستێکی سەیرم لا دروست بوو بوو . یەکەم کۆپلە شعری خوێندەوە بە ناوی (ئەی پەری وون ).**

*ئەی قادری قەدەر نوس*
*پەریەکەی من لە کوێیە..؟*
*دڵم بۆ دیداری ئەو*
*دەمێکە چاوەڕێیە*
*وێنەی وونە لە چاووم..*
*هەستی لەناو ڕۆحمایە..*
*توخوا زوو وەرە ئەی یار*
*دڵم زۆر بە تەنهایە*
*ئەزانم بۆم دەگەڕێیت*
*تۆش وەک من شێت ومەستی*
*ئەگەر بم دۆزیتەوە*
*کۆتایی دێت بەپەستی*
*نزاکە منیش هەروا*
*بەسە ئەم دابڕانە*
*قەدەر یەکمان پێبگرێ*

ماچی کەین ئەو لێوانە
ڕۆحمان تێکەڵ بەیەک بێت
بە هیچ جیانەبێتەوە..
ماچ بکەم بە مەدالیاو
هەر خۆم بیکەم پێتەوە..

**ئامادەبوان چەپڵە بارنێکی بەخوڕیان کرد .. ڕەوەز خەریکی میوزیک ژەندنەکەی خۆی بوو، چەند دەقیقەیک گوێمانگرت.. پاشان ئالان . دەستی کرد بە خوێندنەوەی شعری دووەم..**

واهەست ئەکەم خۆشت ئەوێم
بۆ ناتەوێ..بیدرکێنی ..
جارجار بەسەرنج دانی من
تینویەتی چاووت ئەشکێنی
گەر بەم شێوە بەردەوام بیت
ئازاری ڕۆحی خۆت ئەدەی
نە من دەتوانم پێت بڵێم
نە تۆش ئەتوانی پێم بگەی
درکاندنی ئەو هەستەی خۆت
بە یەک بزە و سەرنجێکە
تا لە ناخەوە بڵێیت ( ئالان)
عاشقی تۆ بووم دەمێکە...

**ئالان هەستێکی ناسکی هەبوو، هەر کەسێک گوێی لە شعرەکانی بگرتایە بە جۆرێک مەست دەبوو،حەزی نەدەکرد تەواو بێت. دوایی ئەوەی ئالان لە دووری نیشتمان هەواڵی مەرگی خۆشەویسترین هاوڕێی پێ دەگات کاریگەریەکی زۆر و بۆشاییەکی گەورە لە سەر دڵی دروست دەکات، بۆ ئاسودەی ڕۆحی هاوڕێ خۆشەویستەکەی وەک وەفایەک کۆپلەیەک شعر ی بۆ ئامادە بوان خوێندەوە.**

**ئامانج...**

*لە سفرەوە نەهاتی .. بەرەو سفر چووی...*
*شعرێکی جوان بوییت .. نەگەشتی بەئاوازەکەت...*
*پڕ بوویت لە نهێنی گەورە .. بۆ زەمەنێک دەگەڕاییت ...*
*ئامانجت بوو ..ئامانجت بێت .. ئامانجەکەت...*
*بێ ئامانج بووین .. بێ ئامانج.. بێ ئامانج...*

**دوای کاتژمێرێک کۆڕەکە بەسەرکەوتوی تەواو بوو...من و ئالان وچەند هاوڕێیەکی ترمان چوین بۆ کافتریای زانکۆ و نانی نیوەڕۆمان خوارد . بەدەم چا خواردنەوەوە کەوتینە گفتوگۆکردن لەسەر هونەر.ڕەوەز دەی ووت : هونەری جاران دڵسۆزانەتر و ڕۆحانی تربوو لە هونەری ئێستا.**
**ئەم هونەرەی ئەمڕۆ هونەرێکی درۆزنی مەکربازە.**

لەبری ئەوەی جوانییەکان دەربخات خۆی دەبێتە بەشێک لە شاردنەوەی جوانییەکان . لەم زەمەنەی ئێستادا مرۆڤ لە هەر شتێک زیاتر پێویستی بە هونەرە .
بەڵام ئەم هونەرە نەک تینویەتی ڕۆحە ماندووەکانمان ناشکێنێت، بەڵکو تینو ترمان دەکات و نەفسێکی نەوسن و چڵێسمان تێدا دروست دەکات .ئالان دەی ووت : ڕاستەکەی ڕەوەز : بەڵام باوکم زۆر جار پێم دەڵێت : کێشەی هونەری ئێستا ئەوەیە لە هونەرەگەورەکەی سروشت دابڕاوە .
ئەم ووت : بابە..!
ئێمە هەموومان دەزانیین سروشت هونەرێکی ناوازەی پێشکەش کردووین، هونەرمەندانیش خەریکی لاسای کردنەوەی سروشتن:: ووتی: کوڕم: سرووشت هیچی پێشکەش نەکردوین، وە ناتوانێت هیچ مان پێشکەش بکات..
ئەم قسەم لا سەیر بوو،ووتم : بابە چۆن ؟؟ مەبەستت چی یە ؟
ووتی : کوڕم: کێشەی هونەری ئێستا ئەوەیە کە وادەزانێت، سروشت هونەرمەندە، لە کاتێکدا سروشت هونەرێکی بەرزی ناوازەیە و سەنعەتی هونەرمەندێکی تری مەزنی جوانکارە..!
پانتاییەکی گەورەی هەموو ئاینە ئاسمانییەکان گرنگی دانە بەڕۆح . بزوێنەری گەورەی ڕۆحیش هونەرە، خودای جوانکاریش گەورەترین هونەرمەندە.
هەر ئەویش مرۆڤی کردوە بە هونەرمەند تا جوانییەکان ببینێت و داهێنان بکات .ئەرکی ئاین ئەوەیە مرۆڤ بکات

بە هونەرمەند. ئاخر هونەرمەند نەبیت : چۆن دەتوانیت خودا بناسیت، چۆن دەتوانییت دەسەڵات و نەخش و نیگارە سەرنج ڕاکێشەکان ببینیت ؟ چۆن دەتوانی زیکر بکەیت و حاڵ بتگرێت و بەرزبیتەوە ؟

چۆن دەتوانیت مەست ببیت ؟ کوڕم : ئەمە کێشەکەیە : هونەرمەندی ئێستا هونەرەکەی مەستی ناکات.. خۆی مەست دەکات.

هونەرمەندی ئێستا خۆی لێ دەبێت بە هونەرمەندی گەورە.. هونەرمەندی گەورە ناناسێت...!!

قسەمان زۆرکرد، کێشەی گەورەی ئێمە ئەوەیە لەسەر هەموو شتێک قسە دەکەین .! ئالان سەیارەیکی پێبوو، کاتێک ویستمان بڕۆین ئالان ووتی :من ماندووم تۆ لێی بخوڕە . سەرکوتین و لە ناو ماشێنەکەدا بێدەنگییەکی زۆر باڵی کێشا بەسەر هەردووکماندا، بە درێژایی ڕێگاکەمان بەدڵ لەگەڵ یەکتر دەدواین .

گەلێ سەختە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کەسێک هاوڕێبی و ڕۆژێک پێی بڵێیت : خۆشم دەوێیت..!

ئالان پێی ووتم : ( کەتی ) باشە تۆ لەبەر ئاوێنەدا پرچت شانە دەکەیت ؟ پێکەنیم . ووتم نانا لەبەر تەلەفزوێندا پرچم دائەهێنم .. هەردووکمان پێکەنین . پرسیارەکەم پێ سەیربوو..! ووتی : تۆ لەبەر ئاوێنەدا قەد بووە قسە لەگەڵ خۆت بکەیت ؟ ڕۆژێک بووە سەیری ئاوێنە بکەیت و کەسێکی

تر جگە لە خۆت لە ناو ئاوێنەکەدا ببینیت ؟ ووتم ناا کەسی چی ! ئەم وەڵامە بۆ ئەو کولانەوەی زامێک بوو کە چەند ساڵە دەیەوێت سارێژی بکات..
من دواجار هەستم بەمە کرد، ئالان کەسێکی قوڵبوو ..هەموو کەس نەی دەتوانی مەلەبکات لەگەڵی دا، ئەو کەسێکی ڕووخۆش وقسەخۆش وسادە بوو، ئەو شتانەی لای زۆربەی خەڵکی گرنگ بوو، لای ئەم زۆر بێمانا بوو، هەر ئەمەش وای کردبوو ئەو قوڵایەیی تیدا بوو لێڵ بێت، دەوروبەرەکەی لێی تێنەگەن، قوڵاییەک پڕ لە جوانی پڕ لە داهێنان پڕ لە پرسیار بەرامبەر بە بوون بەرامبەر بە مرۆڤ بەرامبەر بە ژیان بەرامبەر بە خودا .
ئەو وای دەزانی من باش دەی ناسم .بەڵام لەم تاقیکردنەوەیەدا من دەرنەچووم .. لێرەوە تێگەشتم هەموو پرسیارێک دوو دیوی هەیە : دیوێک من چۆن وەڵام دەدەمەوە دیوێک ئەو چۆن وەڵامەکەی دەوێت. لە ڕوویەکەوە من چۆن لێی تێدەگەم، لە ڕوویەکەوە ئەو چۆن تێم دەگەیەنێت.
من دەڵێم ئەگەر ژیان تاقیمان بکاتەوە، وەک ئەوەی ئێمە دەمانەوێت، هەموومان یەک نمرە بەدەست دەهێنین.
ووتم ئالان گیان : قسەی دڵت بکە، لەمن نیگەران مەبە، خۆ ئەگەر من لە تۆ تێنەگەم، خۆ تۆ لەمن تێدەگەیت :
وە لە ڕاستی دا من باوەڕم بەم تێگەشتن و تێنەگشتنە نییە، چونکە هەمووومان ئەم قسەدەکەین، هەر کەسێکمان دنیاکەی

خۆی لا گرنگ و گەورەیە . چونکە مرۆڤ خۆی گەورەیە .
کێشەی ئێمە ئەوەیە دەمانەوێت خۆمان گرنگ بین، ئەمەش لەسەر حسابی بێگرنگ کردنی کەسانی تر ..
من داوای لێبوردن دەکەم لە تۆ و لە هەموو ئەو کەسانەی تا ئێستا ناسیومن ..!؟
چونکە نەم توانیوە هێندەی چیەتی مرۆڤبوونیان ڕێزیان بگرم، ئەمە لەبەر ئەوەنالێم : کە خۆم نەم ویستوە،
بەڵکو لەبەر ئەوەی نەم زانیوە ئەم کەرامەتەی ناو مرۆڤ ئەوەندە گەورەیە ..
من دڵنیام هەموو جەنگەکانی دونیا کاردانەوەی ئەم بێحورمەتی کردنەیە بەیەکتری .
ئالان هیچی نە دەگوت : لە نزیک لێوی شەقامەکەی بەرامبەر ماڵمان سەیارەکەم وەستان .
ووتم : دابەزە بابچینە ماڵەوە.
نەهاتە ژورەوە و سەر سەیارەکە کەوت و ڕۆشت...
سەعات یانزەی شەو کەمێک چومە سەر ئەنتەرنێت و فەیس بوکەکەم کردەوە،
سەیرم کرد ئالان ئەم شعرەی دابەزاند بوو:

*وێنەکانی سەرنجی تۆ لە ناو دڵما هەڵواسیوە*
*وەک پێشەنگای سەرنج ڕاکێش*
*بە جۆرێکە کەس نەی دیوە*
*هەڵمگرتوە تا ئەو ڕۆژەی بایی عیشق بۆ منت دێنێ*
*بەیەکجاری تۆوی ئەویین لە ناو ناخما ئەچەسپێنێ*
*دەزانم ناتوانی بە چاو هەستی من ڕاکێشی بۆ خۆت*
*وەرە ئازیز گوڵڕێژە دەرگایی دڵم بۆت*

**ئەم شعرانە گومانی زیاتری لای من دروست دەکرد، فەیسبوکەکەم داخست و بیرم دەکردەوە ..**
**نایشارمەوە ئێمە هەستێکی تایبەتمان بەرامبەر یەکتر هەبوو، من ئالانم زیاتر وەک هاوڕێیەک خۆش دەویست، ئالانیش بە هەمان شێوە، بەڵام ئالان لە لایەن خوشکەکەیەوە ناچارکرا بوو، کەبیر لەمن بکاتەوە بۆ هاوسەرگیری، ئالانیش ئەم بیرۆکەیەیی بەلاوە باش دەبێت و ئیتر لەو ڕۆژەوە بە جۆرێکی تر بیر لەمن دەکاتەوە.**
**هەمیشەش ئەم پرسیارە لە ناو مێشکیدا یاری دەکات (ئایا دوو هاوڕێ دەتوانن ببن بە هاوسەر، ئایا دوو هاوسەر دەتوانن ببن بە هاوڕێ؟!) بە ئەرێ وەڵامی پرساری یەکەم دەداتەوە و دەست دەکات بەدروستکردنی وێنەیەک، نەخشەی ژیانی داهاتوی ئەنەخشێنێ.**
**لە دوورترین شارەکانی دونیاوە، گرانترین بۆیەو ڕەنگ دەهێنێ**

و هەر ڕۆژە و بەشێکی وێنەکەی دەکێشێ، خەیاڵ دەی برد بەناو باخی جوانانا، بەناو دەنگی بولبول و ئاوازی تەیر و باڵندەکاندا، بەناو هەموو سەردەمەکاندا سەفەری دەکرد و شاجوان و شاژن و پەریزادەکانی یەکبەیەک دەبینی و لە هەر یەکەیان بەشێک جوانی ئەفڕاند و وێنەی مەعشوقەکەی خۆی ئەکێشا.

خوشکەکەی دەی گێڕایەوە کە زیاتر لە مانگێکە، شەو و ڕۆژ خەریکی ڕەنگکردنی ئەم وێنەیە بوو (هیچ شتێک هێندەی ئەوە خۆش نییە کە خۆت، ژیانی خۆت ڕەنگ بکەیت، خۆت وێنەی داهاتوی خۆت بکێشیت)

ئالان ماوەیەک بوو ڕەفتار وگوفتارەکانی جۆرێک بوو، هەستم دەکرد کێشەیەکی هەیە و لە منی دەشارێتەوە..

وەنەشم دەویست تێکەڵ بە تایبەتمەندییەکانی ببم. منیش نیگەران بووم..

هەزار خەیاڵ وخوتورە دەهات بە مێشکمدا.

ئێوارەیەک پێکەوە چوینەدەرەوە، وەک دوو کەسی نەناس سەیری یەکترمان دەکرد، هەردووکمان جۆرێک بوین، لەسەر کورسییەک کەمێک دانیشتین، ئالان کەمێک چاوی بڕییە چاووم و گوتی : کەتی گیان من تۆم خۆشدەوێت، منیش پێکەنیم و، ووتم منیش بەهەمان شێوە، مەگەر چی بووە ..!

پاشان ئالان ووتی : من دەمەوێت ببیت بە هاوسەرم. ئەم ڕستەیە . زۆر قورس بوو .من ئەوم وەک هاوڕێ خۆشدەویست،

نەک وەک ئەوەی ئەو بیری لێدەکاتەوە، ووتم: سەرەتای یەکتر ناسینمان ئەم خەیاڵانە زۆر جار سەر و دڵی دەگرتم، بەڵام دەمزانی کە تۆ هیچ هەستێکت نییە بەرامبەرم، بۆیە ئەو خەیاڵانە هەرزوو بۆ هەتا هەتایە بابردی.

ئەوکاتەی دەتەوێت شتێک ڕوبدات شتێک بکەیت، گەر نەو توانی و نەکرا، ئەگەر کاتێکی تر گونجایەوە پێدەچێت زۆر درەنگ بێت.

ووتم ئالان گیان :تۆ هاوڕێی منی، من نامەوێت دڵت بشکێنم: دەمەوێت لێم تێبگەیت: دوو هاوڕێ تا ئێرە بێن ئەوەندە ساڵ پێکەوەبن بێ بیرکردنەوە لەم هاوکێشانە، دڵنیابە ناتوانن ببن بە هاوسەری یەکتر، ئەگەر بشبن سەرکەوت و نابن.

ئالان گیان : تۆ کەسێکی ژیریت : ژن و مێردایەتی..

ژن و مێردایەتیە . هاوڕێیەتی هاوڕێیەتی یە ..

ئەمە دوو شتی جیاوازە.. نابێت تێکەڵکەین. ئەگەر ئێمە ببین بە هاوسەری یەکتر ناتوانین وەک دوو هاوڕێ مامەڵەبکەین، چونکە ئێمە دەبین بە هاوسەری یەکتر.

کە هاوڕێیێیەتیەکەشمان نەما، کە لەسەر ئەم بنەمایە بوین بە هاوبەشی یەکتر، ئەوکاتە کێشەمان بۆ دروست دەبێت.

ئالانی دڵناسک : وورتەی لێوە نەدەهات: سەیری باڵای ئەو درەختەی دەکرد لە بنیدا بووین و هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت، حەزم دەکرد پڕ بەدڵ لێوەکانی ماچی بکەم فرمێسکەکانی بسڕم، بەڵام نەم دەتوانی .

سەخترين كات و سەخترين ڕۆژەكانى ژيانم بوو. بە بێدەنگى هەستام و ڕۆشتم، لە ماڵەوە زۆر گريام..

ڕۆژێک دواى ئەم دانيشتنە خوشكەكەى ئالان هات بۆ ماڵمان : زۆر دڵتەنگ بوو، چەند پارچە وێنەيەكە دڕاوى خستە بەردەمم، ووتى : ئەمە پارچەى ئەو وێنەيە، كە زياتر لە مانگێكە ئالان خەريكە بە دروستكردنييەوە، جوانترين وێنەيەک كە تائێستا كێشرابێت ئەم وێنەيە بوو .ئەم وێنەيە، وێنەى ژيانى داهاتوى ئالان بوو، وێنەى تۆ بوو .

بەڵام تۆ ئەم وێنەيەت دڕاند ژيانى براكەشمت سوتاند، من ئەم قسانە غەمبارى نەكردم، بير نەكردنەوە لە ئالانيش ئاسايى بوو لام.

(ئێمەى مرۆڤ ئەكتەرێكين لەسەر شانۆى ژيان مەرج نييە ئەو ڕۆڵەى دەيبينين بە دڵمان بێت) بەڵام ئەوەى زياد لە هەر شتێک خەفەتى پێدام دڕاندنى وێنەكە بوو، تورەبووم ووتم : چۆن شتى واى كردووە ئەم بێ عەقڵە.

ئەمە نازانێت هونەر چييە ؟ ئەم تا دوێنێ بوو، ڕەخنەى لەوانە دەگرت كە هونەر تێک دەدەن، ئێستا ئەمە چيى يە.

(بيرم دەكردەوە تۆ بڵێيت ڕۆژێک بێت منيش هونەرێک بكەم و لەبەر گەمژەيەک بيدڕێنم) نا، نەخێر شتى وانابێت ،

سەرم لێشێوابوو، نەم دەزانى ئايا مرۆڤ گەورەترە لە مرۆڤ يان مرۆڤ گەرورەترە لە هونەر يان هونەر گەورەترە لە مرۆڤ. هەندێک بۆڵە بۆڵم كرد، پاشان پارچە دڕاوەكانى

وێنەکەم هەڵگرت و چووم بۆ لای ئالان و پارچەکانم هەڵدایە بەردەمی ، ووتم : ئالان : ئەمە چ کارێکە کردووتە ..!!
تۆ نازانی یارییەک دەی بەیتەوە، بۆ دەیکەیت، بۆ ئەم وێنەیەت دڕاند، ئایا تۆ واهەست دەکەیت ئەو وێنەیەت بۆ من کێشاوە.نەخێر، هەر گیز ( ئەوە ) وێنەی من نە بووە کێشاوتە، بەڵکو ئەوە وێنەی ئەو کچە جوان و نازدارەی ناو نەستت بوە کە لە ناو باخچەکانی ڕۆحت دا خەریکی گوڵ چنیینە بۆت تاکو چاوەڕوانی دووری تۆ کەم بکاتەوە .
تۆ هەڵەت کردووە، واتزانیوە ئەو وێنەیە منم، هەرگیز کەس نا توانێت وێنەی کەسێکی وا بکێشێت و ئەو کەسەش خۆشی نەوێت، نەخێر : ئەو تۆی خۆش دەوێت.
لەناو هەریەک لە ئێمەدا هاوسەرێکی نمونەی زۆر جوان هەیە، هەر لە منداڵی یەوە بە دوای دا دەگەڕێین .
تا ئێستا زۆر کەسمان بینیوە وامان زانیوە، ئەوە پەریە وونەکەمانە و دۆزیومانەتەوە . بەڵام زۆر جار جگە لە ساویلکەی هەستەکانمان هیچی کە نەبووە.
ئالان لە ناو بێدەنگییەکی قوڵا نوقوم بوو بوو ..منیش لە قسەی خۆم نەدەکەوتم، ووشە دوای ووشە ڕیزم دەکرد و وانەی ژیانم فێردەکرد.
دوای ململانێیەکی زۆر لەگەڵ ژیان لەگەڵ ئەم ڕووداوانە لەگەڵ خۆم، تێگەشتم :لەوەی بۆچی تێناگەم.؟بۆ ئەبێت لە ناو ئازارا بژین، بۆ ئەبێت خەم ئێمە بخوات، بۆ دەبێت ئێمە

خەم بخۆین .؟؟ خەم خۆمان دروستی دەکەین یان بۆمان دروست دەکەن ؟ لەو بێدەنگییەی ئالانەوە گەورەترین هاوارم ئەبیست، هاواری کولانەوەی زامێکی کۆن، هاواری برینێکی تازە بەدەستی ستەمکارێکی نزیک.

لە دوای خەم : بێخەمی، لە دوای بێخەمی :خەم .. ئەمە واتە ژیان .

ئێمە دەبێت بەمە ڕازی بین، ئەگینا ژیان خۆی ڕازیمان دەکات .

لە پڕ باوکی ئالان هاتە ژوورەوە و گوتی : کچم : لەگەڵ کێ دەدوێیت ؟! ئالان کێ یە مەگەر خۆت ئالان نییت !

پێم سەیر بوو ! ویستم دەست بۆ ئالان ڕاکێشم، ئالانێک لەوێ نەمابوو؟!

باوکی ئالان .. نا . باوکی خۆم، دەستی کردە ملم و ماچی کردم، حەپەسانێکی زۆر دابارییە سەر ڕوخسارم . لەشم بە تەواوی خاوبوو بویەوە.

دواجار تێگەشتم :ئالان کەسێک نییە لە دەرەوەی من .

( ئالان ) لە ناومندایە . من لەناو ( ئالان )دا بووم . ئێمە یەکێک بووین، من کۆتا جار کە لە چیرۆکەکە تێگەشتم.

زۆر ترسام : ووتم : هەر بەڕاستی شێت بووم . ( گرێکان بە خۆمانەوەن پێویستە زوو بیاندۆزینەوە، تاکو دەست بکەیین بەکردنەوەیەن ) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ نەهاتمەوە ماڵەوە.

**بەناو کۆڵان و شەقامەکاندا هاوارم دەکرد بەناو بازاڕ و باخچەکاندا بەناو کۆلێژ و زانکۆکاندا بە دەنگی بەرز بانگی ئالانم دەکرد..!**
**ئالان گیان: بۆ کوێ چوییت؟**
**تۆ لە کوێیی؟**
**بەڵام بۆ هەمیشە ئالان وون بوو لە چاوم تا ئێستاش ئالان ئالان ئالانمە ...**

❊

❊

❊